ناوی کتێب : مرۆڤ و ژیان

نوسەر : کاروان سلێمان کاکەمەد

بابەت : لێکۆڵینەوە

بەرگ : حەوتەم

تایپ : نوسەرخۆی

نرخ : دیاری یە

دیاری یە بۆ /........................

بەرواری :    /    /

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپارد
نی (٦٧٣)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە.

**لەبارەی هاوسەرگیری و ژیانی خێزانی :**

**گرینگترین بڕیارلەژیانی مرۆڤ دابریتییە لەهەڵبژاردنی هاوسەر ، چونکە تاکۆتایی ژیانە و هاوڕێی هەمووتەمەنە بۆیەپێویستە ئافرەتێکی ڕۆشنبیربدۆزیتەوە بۆئەوەی لەداهاتوو پاشگەزنەبیتەوە لەوبڕیارەی کەداوتە٠**

**(س) دەڵێ : ((جوانکردنی دیکۆری دەرەوەوجل وبەرگی جوان ڕۆڵی خۆی دەبینێت لەپرۆ سەی هاوسەرگیری داو لەناوخەڵك بەگشتی))٠**

**(ك) دەڵێ : ((کچ وکوڕبۆمن فەرقی نییە هەموویان منداڵن و خودادەیبەخشێت ، قەتیش لەگەڵ ئەوەدانیم ، کەهەندێ کەس حەزی لەڕەگەزێکیانە))٠**

**(ن) دەڵێ : ((کچ بۆماڵ جێی ئاسوودەییە،چونکە کچان زیاتربێدەنگن وەك لەڕەگەزی نێر))**

**(م) دەڵێ : ((ئەومنداڵە کوڕبێ یان کچ بێ کامیان باشتربێ))٠**

**(م) دەڵێ : (( کچەکەم هەمووهەفتەیەك سەردانم دەکات ، بێگومان منداڵەباشەکەیانت خۆ شتردەوێ))٠**

**(گ) دەڵێ : ((لەکۆمەڵگەی ئێمەدا ڕێزی کوڕزیاترە لەبەرئەوەی دەوترێ کچەکەبەخێودەکر ێ بۆخەڵك ، بەڵام کوڕەکەکاردەکات و یارمەتی باوکی دەدات))٠**

**(ژ) دەڵێ : ((بەڕای من کچ بۆدایك باشترە ، چونکە یارمەتی دەدات ئەوەی خواش بیدائەوبا شە))٠**

**(س) دەڵێ : هەرچەندە کچ وکوڕجیاوازی نییە ، بەڵام کچەکانم حەزیان لێیە براکەیان تاقا نەنەبێت و برای هەبێت))٠**

**(ئە) دەڵێ : ((کچ وکوڕجیاوازییان نییە، بەڵام خۆشە خێزان لەکچ وکوڕو دایك وباوك پێك بێ))٠**

**(ك) دەڵێ : ((لەنێوان کچان وکوڕان دا چەندین دایك لەخانەی بەساڵاچووان دەژین))٠**

**(ح) دەڵێ : ((من خاوەن دووکچم و زۆرحەزم دەکرد لای یەکێك لەکچەکانم ژیانم گوزەراند با ، منیش وەکوهەموودایکێك ماندوویەتی و هیلاکیم پێوەچەشتوون٠کچە بچووکەکەم زۆر حەزی دەکردلای بم ، بەڵام لەگەڵ ماڵەخەزورانییەتی ناتوانێت من لەخۆبگرێت ، کچێکی د یکەم هەیە وەزعی ماددی زۆرباشە ، بەڵام حەزناکات من لەلای بم، لێرە لەخانەی بەساڵاچو**

وان ژیانی خۆمان بەسەردەبەین))٠

(ع) دەڵێ : ((خیانەتی هاوسەری بەهۆی لاوازی ئیمانەوەیە ، خیانەتیش ڕۆژێك دادێ هەر ئاشکرادەبێ ، ژن و پیاویش بۆنی ئەم خیانەتەلەهاوسەرەکانیان دەکەن و کێشەکەش یان بە کوشتن یان بەتەلاقدان کۆتایی دێ))٠

(م٠م) پەنجا ئامۆژگاری بۆئافرەتان کردووە ، هەندێکیان :

١ — پیاوحەزبەئافرەتی خۆسەپێن ناکات٠

٢ — نابێ ئافرەت برادەرایەتی هەمووجۆرەئافرەتێك بکات٠

٣ — نابێ ئافرەت باسی کردەوەکانی پیاوەکەی بگێڕێتەوەتەنهائەوانەنەبێ کە پیاوەکەی پێی خۆشە٠

٤ — لەسەرتەلەفۆن زۆرقسەی مەکەودرێژەبەقسان مەدە٠

٥ — ڕۆژانە وابکە قورئان لەماڵەکەت لێ بدرێ ، چونکەئەوماڵەی قورئانی تێدادەخوێندرێ شەیتان لێی ڕادەکات و فریشتەی ڕەحمەت دەورەی ئەوماڵەدەدەن٠

٦ — زۆرڕێزلەپیاوەکەت بگرەوشانازی پێوەبکەلەبەرامبەرخەڵکی٠

٧ — شتی وابکە کەڕێزگرتنی پیاوەکەت تێدا ڕەنگبداتەوە بەم هۆیەش ڕێزی خۆت زیاد دە کەیت٠

٨ — پیاوەکەت بەهۆی چاك ڕەفتاری تۆوە ڕێزلەبنەماڵەوکەس وکاری تۆش دەگرێت٠

٩ — بەردەوام هەوڵ بدەپێش هاتنەوەی پیاوەکەت ئیشی ماڵەوەت تەواوکردبێ٠

١٠ — بەردەوام مانگانە شتێك پاشەکەوت بکەبۆکاتی پێویستی٠

١١ — نەکەی لای پیاوەکەت سەرسامی بەپیاوێکی تردەربڕی جاهونەرمەندبێ یان وەرزشوان

(ع) دەڵێ : ((پێویستە لەسەرخوازبینی کاربەخوازبینی کراوبلێ لەکاتی دانانی تەختەوکور سی بۆبووك وزاوا بەتەوقەنەکردنی ئافرەت لەگەڵ نامەحرەمەکانی لەخزم وکەسەکانی لە پیاوان))٠

(ع) دەڵێ : ((لەڕێی مۆبایلەوە منداڵ تووشی زۆر زەرەر و زیان دەبێ لەڕووی پەروەردەیی یەوە لەوانەیە ماڵپەڕی جنسی بکاتەوەیان نامە بۆخەڵك بنێرێ منداڵ فێری ڕەوشتی خرا پ دەکات و دووردەکەوێتەوە لەخوێندنەکەی بۆیە پێویستە دایکان و باوکان مۆبایل بۆ —

منداڵی بچووك نەكڕن ئەگەربۆشیان كڕین مۆبایلی بەكامێرا و بلوتوزنەبێت و بەردەوام چا
ودێری ناومۆبایلەكەی بكرێ لەوێنەی خراپ و نامەی نێردراو))٠
(ع) دەڵێ : ((ئەی كچەشیرینەكەم من ماڵئاواییم لەگەنجی كردووە پەندوئامۆژگاریم لەدنیا
وەرگرتووە گوێم لێ بگرە زۆرهاوارمان كرد ، كەڕەوشت لەدەست دەرچووە فریای بكەون و
قەلاچۆی بكەن نووكی پێنووسەكانمان كوڵ بوو ، دەنگمان نووسا ئەوەندەمان ووت هیچمان
پێنەكرا بەڵكوهەروادێ ڕووتی ئافرەت زیاتردەبێت٠كچەشیرینەكەم لاشەی ئافرەت خاوەن –
كێشكارییەكی زۆربەتینە بۆڕاكێشانی پیاو ، لاشەی ئافرەت وەك خۆراك وایە هەتازیاتردایۆ
شراوبێت پاكترە ، بەلأم ئەگەرسەری والأبوو مێشی لێ ئەنیشێ))٠
(ع) دەڵێ : ((زۆرجارپیاوان شەرم دەكەن بەدەم بەهاوسەرەكانیان بڵێن خۆشم دەوێی ، بەلأ
م دەتوانێ گوڵێكی بداتێ بۆئەوەی زیاترخۆشەویستی دروست بێ))٠
(م) دەڵێ : ((هیچ خێزانێك مەحالە دەمەقاڵێ وناخۆشی لەنێوانیان دروست نەبێت))٠
(ع) دەڵێ : ((پێویستە پێش پڕۆسەی هاوسەرگیری خولی ڕۆشنبیری بۆئەوكەسانە بكرێتەوە
كەهاوسەرگیری دەكەن٠لەوێ باسی ژیانی هاوسەرێتی وچۆنیەتی مامەڵەكردنیان لەگەڵ یە
كتربۆبكرێت))٠
(ك) دەڵێ : ((پڕۆسەی هاوسەرگیری پێویست بەپشكنیی پزیشكی دەكات، تابزانرێت خوێنیا
ن بۆ یەكتردەگونجێت ، ئەگەر نەگونجا بەدەرزی لێدان و چارەسەری پزیشكی وادەكرێت خو
ێنی كوڕوكچەكە بگونجێندرێت))٠
(ع) دەڵێ : ((ڕازی بوونی ئافرەتی یەكەم مەرج نییە لەفرەژنی ، بەلأم پیاوئەگەرویستی ژ
نی دووەم بێنێ بادڵنەوایی بكات و بەڕوێكی خۆش لەگەڵی دابنیشێ و بەهێمنی پێی بڵێ
وە بڕەپارەیەكی پێبدات ئەوەندەی كەلەتوانای دا هەیە وەدوای هێنانی خێزانی دووەم هە
ڵسوكەوتی لەگەڵ خێزانی یەكەمی نەگۆڕێ بەڵكولەسەری پێویستە دادوەری بكات لەنێوان
خێزانەكانی٠وەئەگەرئافرەت ڕقی لەفرەژنی ببێتەوە بەهەڵگەڕانەوە لەدین دانانرێ))٠
(ع) دەڵێ : ((ئەگەرهاتوو ئەوئافرەتەی كەدایكت فەرمانی پێكردووی تەلاقی بدەی ڕێك و
پێك بێ و ئەزیەت دەری دایكت نەبێ ئەوەنابێ تەلاقی بدەی نابێ لەوە گوێڕایەڵی بكەی))٠
(ع) دەڵێ : ((جاری واهەیە پیاوەكە قەناعەتی هەیە ، بەلأم ژنەكە نییەتی٠ژنی واهەیە –

دەچێتەبازاڕ هەرچی بینی و پێی جوان بوو یان ڕیکلامی بۆکرابوو دەیکڕێت))٠
(س) دەڵێ : ((پێویستە دایك هەمووجۆرە خواردنێك نەداتە منداڵەکەی ، چونکە منداڵی بچووك گەدەی لاوازە توانای هەرسکردنی هەمووجۆرە خواردنێکی نییە))٠
(م ف) دەڵێ : ((پێویستە دایك و باوك ستەم لەمنداڵەکانیان نەکەن و نەیانکەن بەدوژمنی یەکتری بەوەی کەهێشتا خۆی لەژیان دا ماوە دوکان یان خانوو لەسەریەکێکیان تاپۆدەکات ئەی ئەوانی دی ؟))٠
(م ف) دەڵێ : ((زۆرجارهەندێ گوندوناوچەودەڤەری واهەیە ناوبانگی بەشەڕوئاژاوە ڕۆ — یشتووە ، بۆیە ئەگەرکەسێك هیچ کێشەیەکی نەبێ خەڵك هەیە ئامادەنییە کچی خۆی بدا تێ بەبیستنی ناوی ئەوگوندە ، کەخەڵکی فلاّن شوێن بەشەڕوئاژاوەو توڕەوتوندناسراون))٠
ئافرەتێك بەناوی ئومامەی کچی حارثە کاتێك کچەکەی بەشوودا کاتی گواستنەوەی بۆما ڵی هاوسەرەکەی ئەم ئامۆژگاریانەی کچەکەی کرد :
١ — کچەکەم پێش ئەوەی مێردەکەت بگاتەوە ماڵەوە سفرەت ئامادەبێ و بزانە حەزی لە چ خواردنێکە بۆی ئامادەبکە ، چونکە پیاوی ماندوو کەهاتەوە ماڵەوە برسییەتی ئەگەر نان ئامادەنەبێ ڕەنگە توڕەببێ٠
٢ — ئاگات لەماڵ و سامانی بێ بەتایبەتی لەسەرەتای ژیانی هاوسەریتان کەتازەماڵن و پێو یستیتان زۆرە مەرج نییە دڵت حەزی لەچی بوو بیکڕی و تووشی قەرزکردن ببن٠
٣ — نهێنی ناوماڵەکەت و مێردەکەت بۆکەس باس مەکە بابۆمنیش بێ کەنزیکترین کەستم ، چونکە مێردەکەت بزانێ متمانەی پێت نامینێ٠
٤ — ئەگەرلەکاتی توڕەبوون دا قسەیەکی پێ ووتی یان بەخراپ باسی ئێمەی کرد نەکەی بۆ مان بگێڕیتەوە ، چونکە ئێوە ژن ومێردن بۆخۆتان ئاشت دەبنەوە ، بەلاّم ئێمە لەدڵمان دە رناچێ و زاواکەمان لەبەرچاودەکەوێ٠

## ئافرەت نیوەی کۆمەڵە :

ئافرەت نیوەی کۆمەڵە قسەیەکی زۆربلاٚوە٠هەندێ کەس بۆخۆدەرخستن بۆئەوەی بڵێن : ئێمەڕێزلەئافرەت دەگرین دەڵێن : ئافرەت نیوەی کۆمەڵە)) ، ئافرەت میهرەبانە ، دڵنەرمە ، ٠٠٠تاد٠ئەم ڕستەیە وەکوجیاکارییەك بەکاردێ ، ئەگینا ئەگەرئافرەت نیوەی کۆمەڵ بێت هەرچەندە ئەگەرسەرژمێری بکرێ ژمارەی ئافرەتان لەنیوەی زیاترە ، بەلاٚم ئەگەرئافرەت نیوەی کۆمەڵ بێت ، کەواتە پیاویش نیوەی کۆمەڵە، ئەی بۆچی ناڵێن پیاونیوەی کۆمەڵە ؟ لەساڵی (٢٠١٤) زڕدایکێك کوڕێکی تەمەن چوارساڵی لەحەمام لەکاتی سەرشوشتن دا کوشت ، کەئەوەندەی بەجام لەسەری دابوو مێشکی نەزیف بوبوو وەمنداڵە کچەدووساڵەکەشی هە مووجەستەی شین و مۆرکردبوو٠

هەروەها لەساڵی (٢٠٠٨) لەهەولێر منداڵێکی تەمەن پێنج ساڵە لەلایەن زڕدایکەکەی دوای — شکانی قاچی کەهیندەی بەدیوارکێشابوو ، لەسەربان بەستبووویەوە کەلەبرسان ولەسەرمان هاواری کردبوو دەستی خستبووە سەردەمی تاخنکاندبووی٠

وەلەساڵی (٢٠١٩) لەشاری دهۆك پیاوێك بەهاوکاری زڕدایکەکەی کچێکی بچووکی بەفێڵ برد بوو کەهەوڵی دابوو دەستدرێژی بکاتەسەری خۆی تەسلیم نەکردبوو ، دووداری لەملی دابوو کوشتبووی ، پۆلیس لەڕێگەی تەماشاکردنی (٣٠٠)سێصەد کامیرای چاودێری بکوژەکەیان دۆ زییەوە٠

## ئافرەت و ئاڵوودەبوون بەئینتەرنێت :

لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان دا زۆرفیتنە هەیە ڕووی لێمان کردووە ، یەکێك لەوفیتنانە فیتنەی ئینتەرنێتە٠کەڕۆژی (١٠ – ١٥) سەعات خۆیان بەوئامێرە خەریك دەکەن زۆرئافرەت هەیە ئەوەندەخۆی خەریك دەکات ، کەمێردەکەی لێی بێزاردەبێت٠لێکۆڵینەوەیەك کراوە بۆهەر دووڕەگەز لەنێوان بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت دەرکەوتووە ، کە ژنان (٣٠٪) لەپیاوان زیاتر بەکاردەهێنن٠

ئەوئافرەتانەی زۆربەی کاتەکانیان بەئینتەرنێت بەسەردەبەن چەندین کاریگەری هەیە لە سەرخێزان کەوائافرەتی واهەیە هەمیوودەم بەمۆبایلەکەیەوە نووساوە ئەمەش وادەکات کارە کانی خێزان بەلاوەبنێت و گرینگی بەخێزانەکەی نەدات و ببێتەگرفت بۆپیاوەکەی٠

ئەوئافرەتەی ئاڵوودەی مۆبایل بووە تەنانەت کاتەکانی خەوتنی کەم دەبێت بەهۆی مانەوە ی بۆماوەیەکی زۆرلەسەرهێلی ئینتەرنێت ، کەزۆربەی کاتەکانی بەسەردەبات بەگەڕان بەنا وفەیسبوك٠کاتێکیش لەخەوهەڵدەستێت زۆرماندوو وشەکەت دەبێت ، چونکەتاکاتژمێرێکی درەنگی شەونەخەوتووە ، بۆیەئەگەرخەتی ئینتەرنێت قەدەغەبکرێت زۆربەسوودە٠

## ئافرەت و هۆشیاری کۆمەڵایەتی :

زۆرجارهەندێ لەکوڕان نوکتەدەگێڕنەوە بەرامبەرهەندێ لەهاوڕێ کچەکانیان بەکاری دە ینن یان بۆمۆبایلەکەی دەنێرێ بەمەبەستی ئەوەی لەڕێی ئەم نوکتانەوە (نوکتەی جنسی) ڕێگایەك بکەنەوە بچنە نێوباسکردنی جەستەیان بەشەرم شکاندنیان هێواش هێواش ئەوئا مانجەی هەیانە لەگەڵ ئەوکچە بێنێتەدی ودواتر لەخشتەی بەرێت وتووشی ئابڕووچوونی بکات٠چونکەهەرکوڕێك نوکتەی لەم جۆرەی ئاڕاستەکردوئەویش بەپێکەنین وڕوویکی خۆ شەوە قبولی کرد ، شەرمی لێ دەشکێت و ئامادەدەبێت باسی جەستەی بکات و لای هاوڕێکا نیشی بەشانازییەوە باسی دەکات کەبۆئەم کچانەی دەنێرێت لەکۆتاییشدا بەزەرەری کچەکە تەوادەبێت و ئابڕووی پێ لەکەداردەبێت٠

(ن) کچێکی فەرمانبەرە ، دەڵێ : ((دوای ماوەیەکی کەم لەناسینی کچ و هاوڕێیەتی کردنیان چ لەفەرمانگە یان لەدەرەوەی فەرمانگە یان لەنێوکۆلیژوپەیمانگاکان دوای ناسین بەهۆی کو رتەنامەی مۆبایلەوە بەیانی باش و ئەحوال پرسین دوای ماوەیەکی کەم ناوەناوە پەنادەباتە بەرناردنی نوکتەی جنسی دوایی کەزانی کچەکە قبولی دەکات ، ئەمجارەیان داوای کرداری - جنسی لێ دەکات٠دەڵێ : یەکێ لەهاوڕێ کوڕەکانم درەنگانی شەو نامەونوکتەی بێ مانای بۆ ناردم دەیگووت : نوکتەکان چۆنن ؟ بەدڵتە ؟ سەرەنجام گەیشتە ئەوەی باس لەشوێنەکانی جەستەی مرۆڤ بکات وداوای کرداری خراپم لێ بکات ! دواتربیرم کردەوە چۆن ئەم هەڵە یە م کرد ڕێگە بدەم بەناوی هاوڕێیەتییەوە نوکتەی وا وەربگرم ئەی ئەگەر ئەم کوڕە نوکتەکا نی پیشانی کەسێکی دیکەدا چی بکەم ؟

(ت) کچێکی قوتابییە لەکۆلیژی(        ) دەڵێ : ((کوڕان مەبەستی خۆیان هەیە ، هاوڕێی کچم هەبووە کەزانیومە لەگەڵ کوڕان نوکتەی جنسی دەگۆڕنەوە لێی دوورکەوتوومەتەوە ، چونکەدەزانم ئەم کوڕەبەچاوی سووك سەیری منیش دەکات))٠

**باسی ڕەشکردنی جامی ئۆتۆمبێل :**

**ڕەشکردنی جامی ئۆتۆمبێل لەزۆربەی ولآتان ڕێگەپێدراوە ، لەهەرێمی کوردستان بەگشتی بەرپرسەکان هەڵدەستن بەڕەشکردنی جامی ئۆتۆمبێلەکانیان ، بەمەبەستی پاراستنی گیا- نی خۆیان واتا ڕەچاوکردنی لایەنی ئەمنی.**

**هەرچی گەنجەکانن جامی ئۆتۆمبێلەکانیان ڕەش دەکەن بۆمەبەستی جیاجیا ، هەندێکیان جامی ئۆتۆمبێلەکانیان ڕەش دەکەن بۆئەوەی ئۆتۆمبێلەکانیان بەرچاوو شازبێت بەتایبەتی ئەوانەی ڕەنگی ئۆتۆمبێلەکانیان ڕەشە حەزدەکەن جامەکەشی ڕەش بێت بۆئەوەی بەرچاوو شازبێت واتا هۆکارەکەی بۆئەوانە تەنها جوانی یەوبەس هیچ مەبەستێکی تریان نییە.**

**هەندێکیش مەبەستی خۆیان هەیە بۆنموونە لەوانەیە بیانەوێ کرداری خراپ لەناوبکەن — کاتێ خۆشەویستەکەیان یان هەرکەسێکی دیکەسواردەکەن بۆئەوەی کەس نەیان بیننێ ئە گینائەوانە خۆهیچ مەترسییان لەسەرنییە.**

**هەندێکیش والێکدەدەنەوە هەرئۆتۆمبێلێك جامی ڕەش بێت واتا (بەرپرس).**

**هەندێکیش چێژلەوەدەبینن خەڵکی لەدەرەوە ئەونابینن ، بەلآم ئەوئەوان دەبینێت.**

**(لەگۆڤاری راکۆ ژمارە(٩)ی ساڵی (٢٠١١) وەرگیراوە بەدەستکارییەوە لەگەڵ گۆڕینی ناونیشانە کەی).**

**باسی تیژڕەوی :**

**شوفێرحەزدەکات ئۆتۆمبێلەکەی خێرالێ بخوڕێت بەهۆی زیاد داگرتنی پەیدانی بەنزین ، کەژیانی خۆی و سەرنشینەکان دەخاتە مەترسییەوە بەمەش وەك کەسێکی سەرەڕۆی لێ دێت٠پیادەکردنی ڕەوشت بەرزی مانای ڕێزگرتن و پابەندبوون بەیاسادەگەیەنێت ، هەروە ها ڕێزگرتنی شوفێرەکانی تربەوەی کەواسوکانیان بەسەردا نەشکێنێتەوەوڕێزگرتنی پیادە لەکاتی پەڕینەوەی دا ، ڕێزگرتن لەیاساکانی هاتووچۆ ، هەروەها لەشوێنی نەگونجاو ئۆتۆ — مبێل ڕانەگرێت یان لەناوەندی شەقام دووشوفێرقسەلەگەڵ یەکتردا دەکەن بێ گوێدانە ئە وهەمووسەیارەی دوای خۆیان ئەمانەوچەندین ڕەفتاری تردەرچوونە لەڕەوشت بەرزی و ز ۆرترین ڕووداوی هاتووچۆ بەهۆی خێرایی لێخوڕینەوەن ، وەك چۆن لەچوون بۆبەرەکانی جەنگ کەس دڵنیانییە بەسەلامەتی یان برینداری یان مردوویی دێتەوە٠(لەگۆڤاری سایك ، ژمارە (٨)ی ساڵی (٢٠٠٨) وەرگیراوە بەدەستکارییەوە)٠**

## سروودی نیشتمانی :

سرودی نیشتیمانی بریتییه له هۆنراوەی شاعیرێك ، كەناوەڕۆكەكەی دەربارەی نیشتیمان ونەتەوەیە ، خۆشەویستی خاك و ولأتی تێدایە هەروەهاباسی قوربانیدانی ڕۆڵەدڵسۆزەكا — نییەتی ، ئەم بەرهەمەش دەبێ هەندێك حەماسەتی تێدابێ٠

زۆرجارهەندێ بەشی ئەوسرودە هەڵدەبژێردرێت و بەمۆسیقای تایبەت تۆماردەكرێت بۆئە وەی لەكۆبوونەوەڕەسمییەكاندا لێ بدرێت ، كەپێی دەوترێت سلأوی كۆماری ئەگەرئەودەوڵە تەكۆماری بێت ، وەئەگەرپاشایەتی بێت پێی دەوترێت سلأوی شاهانە٠

لەهەندێ ولأت دا ئەم سرودە هەمووبەیانییەك بەقوتابیان دەوترێ یان بۆیان لێ دەدرێت له هەندێك ولأتیش دا له هەمووڕادیۆ و تەلەفزیۆنێك بەم سرودەبەرنامەكانیان دەست پێدەكە ن و كۆتایی پێ دێنن٠

هەمووەدەوڵەتێك سرودی فەرمی خۆی هەیەو سرودی نیشتیمانیش لەدوای دروستبوونی دە وڵەتی نەتەوەیی هاتۆتەكایەوە ، لەهەرێمی كوردستانیش سرودی نیشتیمانی (ئەی ڕەقیب)ە ، كەهۆنراوەی دڵداری شاعیرە كەبووەبەمارشی نەتەوەیی ، دڵداری شاعیرئەم شیعرەی لەكەر كوك داناوە لەساڵی (١٩٣٨)٠

هەندێ وتەودەستەواژەی ئەم سرودە بەهەڵە لێكدانەوەی بۆدەكرێ وەكو :

ڕەقیب : لەڕاستی دا مەبەست ئەوانەیە مراقەبەی خەڵكی دەكەن ، جاسوس٠

تۆپی زەمان : تۆپی ئەوسەردەمە كەبۆدەست بەسەرداگرتن بەكاردێ٠

بەلأم ئەوەی كێشەیە ئەونیوەدێرەیە، كەبەبیستنی بیزاردەبی : دینمان ئاینمانە نیشتیمان٠

(لەگۆڤاری چلاواز ، ژمارە (٣٧)ی ساڵی (٢٠٠٩)وەرگیراوە بەدەستكارییەوە)٠

## هۆشیاری تەندروستی :

لەناوخەڵکی دا دیاردەیەکی مەترسیدارهەیە ، کەزیانی هەیە بۆتەندروستی ئەویش بەکار-
هێنانی دەرمان هەرلەخۆیانەوە بەبێ ڕاوێژکاری پزیشکان٠
هۆیەکی ئەم دیاردەیە ئەم دیاردەیە تەمبەڵی نەخۆشەکەیە ، کەتاقەت وتوانای نییە بچێتە
نەخۆشخانە یان لای یاریدەدەری پزیشکی لاکۆلأن بۆیەعیلاجێك بەکاردەهێنێت کەنەخۆ —
شێك یان کەسێکی نزیکی بەکاری هێنابێ کەنیشانەکانی لەوبچێ٠(لەژمارە ١٨ی ساڵی ١٩٩٣ی
گۆڤاری پەیامی ڕاستی وەرگیراوە)٠

زانست ڕوناكی یە :

بۆیە وتراوە زانست ڕوناكییە ، چونكە بەهۆی ڕوناكییەوە شت دەدۆزرێتەوە٠

(ع) دەڵێ : هەمووجارێ كەمامۆستاڕۆژێك بۆتەلەبەدیاری دەكات ودەڵێ لەم ڕۆژەدا تاقیكرد نەوەهەیە ، هەڵوێستی قوتابیان بەرانبەربەم تاقیكردنەوەیەوخۆئامادەكردن بۆی دەبنە دو وكۆمەڵە ؛كۆمەڵێكیان هەرلەوكاتەی مامۆستا ئەو هەواڵەیان دەداتێ خەمێ دەیانگری وئیتر هەرلەوڕۆژەوە كەدەچنەماڵەوە ڕۆژێ بەڕۆژێ خوێندنی خۆیان دەكەن وهەوڵی خۆیان دەدە ن وبەرەبەرەخۆیان ئامادەدەكەن ، وەلەپێناوی ئەم تاقیكردنەوەیە وازلەیاری وگەڕان و سوڕ ان دەهێنن٠بۆیە كەڕۆژی تاقیكردنەوەدێ بەسەربەرزییەكی تەواودەردەچن ، بەڵام كۆمەڵی دووەمیان كەمامۆستاباسی تاقیكردنەوەیان بۆدەكات هیچ نایان بزوێنێ ، لەوڕۆژانەی پێش تاقیكردنەوە وازلەیاری كردن وگەڕان وسوڕان ناهێنن لەپێناوی تاقیكردنەوەكە٠جاكۆمەڵی دووەم ئەنجامیان بەساقیت بوون دەگات ، بەڵام دەبێ بزانین بۆهەریەكەیان هۆیەكی جیاهە بووە وای لێكردووەكەمەسەلەی تاقیكردنەوەكە بەهەندهەڵنەگرێ وبەسادەیی وەری بگرێ :

١ – هەیانەدەڵێ مامۆستاكەمان بەزەییە وكەس ساقیت ناكات و یارمەتیمان دەدات٠

٢ – هەیانەخزم یان ناسیاوێكی هەیەومامۆستاكەدەناسی بەتەمای ئەوەیە بەهۆی ئەوەوە وا سیتەیەك بكات ودەربچێ٠

٣ – هەیانە بەتەمای ئەوەیە برادەرەكانی لەژووری تاقیكردنەوە یارمەتی بدەن و هەندێكی پێ بڵێن و دەربچێ٠

٤ – هەیانەبەتەمایە مامۆستاجارێكی ترتاقیكردنەوە بكاتەوە (خولی دووەم) لەوجارەدا هەو ڵی بۆبداودەربچێ٠

٥ – هەیانەنیازی ئەوەی هەیە قۆپیە بكا٠

٦ – هەیانەكوڕی پیاوێكی بەدەسەڵاتە پشت بەوەدەبەستێ ئەم دەسەڵاتەی باوكی لەساقیت بوون بیپارێزێ٠

٧ – هەیانەكوڕی پیاوێكی دەوڵەمەندە وادەزانێ ئەوپارە و سامانەی باوكی ناجیح بوونی بۆ دەكڕێ٠

٨ – هەیانە دەڵێ تاقیكردنەوە هەمووی هەڵبژاردنە وەڵامی دایە بەتەمایە خۆوشەنس دەر

بچیٚ٠

(د)بەقوتابی دەڵێت : بەشەوان مەڕۆدەرەوە وخۆت خەریکی شتی لاوەکی مەکە ، لەپۆل دا گویٚ لەمامۆستابگرەوکەچوویتەماڵەوە پێداچوونەوەی وانەکانت ئەنجام بدە دڵنیابەسەرکە وتوودەبی٠

(ش) دەڵیٚ : ((دەبیٚ جەدوەلی خوێندن وسەعی کردن بۆهەروانەیەك دابنێی و بەیانیان زوو هەڵسەسەعی بکە ، چونکە خوێندنی بەیانیان زۆرگرینگە ، شەوانیش زووبخەون تابەیانیان زووهەستن و هیلاك نەبن بەهۆی نەخەوتنەوە))٠

(ڕ) دەڵیٚ : ((دەبیٚ لەپۆل داجوان گویٚ بگرین و مامۆستاهەرچی باس کرد بەتێبینی بینوو سی ، ئەگەرشتێکیشت نەزانی لەکاتی خۆی دا لەمامۆستابپرسە تابۆت دووبارەبکاتەوە))٠

(پ)دەڵیٚ: ((هەوڵ بدەلەبابەتەکان تێبگەی بۆئەوەی زۆرترین کات لەمێشکت دا بمێنێتەوە))

(س) دەڵیٚ : ((تاکودوورنەکەویەوە لەئینتەرنێت و برادەری خراپ قەت سەرکەوتوونابی))٠

(ع) دەڵیٚ : ڕێگای بەدەستهێنانی زانست :

یەکەم : ڕێگەی وەرگرتن لەدەمی مامۆستاوە٠

دووەم : خوێندنەوەی ئەوپەرتووکانەی کەلەوبوارەدا نوسراون٠

(ع) دەڵیٚ : ئەوکۆسپانەی ، کەتووشی قوتابی دەبێت : گەورەیی تەمەن ، چونکە هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی بەخێوکردنی خێزان و منداڵ دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی کاتەکانی فێر بوون بۆیە پێویستە قوتابی ئاگاداربی تەمەنی بەفیڕۆنەڕوات ، چونکە نەبوونی هاوتەمەن کێشەیەکی ترە ، کێشەیەکی دەروونییە٠

(ع) دەڵیٚ : ئەوەی پرسیارت لیٚ دەکات لەڕووت بیٚ بڵیٚ نازانم ، ئیمامی مالیك (٤٨) چل وهە شت پرسیاری لێکرا دەربارەی (٣٢)سی ودوویان وتی : نازانم تەنها (١٦) شازدە پرسیاری وە لاٚم دایەوە٠

(ع) دەڵیٚ : دەبیٚ مامۆستا دووربیٚ لەگاڵتەوگەپ ، چونکە مامۆستابەوە بەهای نامینیٚ ، دە لێن جارێکیان خەڵکی دێیەك دەچن بۆسەیران مامۆستاش لەگەڵ خۆیان دەبەن ، کەدەگە نەئەویٚ دەست دەکەن بەگاڵتەوگەپ مامۆستاش بەرئەوگاڵتەیە دەکەویٚ و کۆمەڵیٚ شەق دە خوات و چوارپەلی دەگرن و دەیخەنە ناوئاو!

(ع) دەڵێ : ((هەبوونی زانستی شەرعی پێویستی هەمووئینسانێکە بۆنموونە لەبازرگانیکر
دن دا بزانی کام ئیش حەلالە یاخود حەرامە))٠

(ع) دەڵێ : ((زانکۆناوەندێکی مەعریفی یە ، دەرچووانی زانکۆی ئێستا ئاستی زانستییان وە
کوکەسێکی جاران وایە کەبڕوانامەی شەشی سەرەتایی هەبێ ، چونکە نەزمانێکی دیکە دەزا
نێ ، نەزانستی پێیە))٠

(م م) چەندئامۆژگارییەکی قوتابیان دەکات لەکاتی نزیکبوونەوەی تاقیکردنەوەکان :-

١ – کاتی زیاتردابنێ بۆئەووانەیەی بەلاتەوەگرانە٠

٢ – کات بەفیڕۆمەدەبەتۆپانێ وبەدیارتەلەفزیۆن وخۆخەریککردن بەمۆبایلەوە٠

٣ – داوای دوعالەدایك و باوکتان بکەن ، چونکە نزای دایك و باوك بۆمنداڵەکانیان قبولە٠

## هەڵەی ڕێزمانی لەشێوەی هەولێری و سلێمانی :

هەولێرخاوەنی چەندهەزارساڵ مێژووە ، چ لەکاتی هێرشی هۆلاکۆ پێش ئەومێژووەش شا
ری هەولێرمێژووتۆماری کردووە٠بەلاّم لەڕووی زمانەوە شێوەی سلێمانی کەمترهەڵەی تێد
ایەورێك وپێك ترە ، هەروەهالەڕووی زمانپاراوییەوە گەورەترین گرفتی پەیامنێران لەپار
ێزگای هەولێرئەوەیەچۆن کەسێك بدۆزنەوە قسەیان بۆبکات ، بەلاّم خەڵکی سلێمانی لە —
قسەکردن پەکیان ناکەوێ٠

ئەگەرچی لەڕووی ڕێزمانەوەشێوەی سلێمانیش هەڵەی تێدایە ، بەلاّم شێوەی هەولێرهەڵە
ی زۆرترتێدایە٠

نموونە :

لەسلێمانی دەڵێن : ((یاومەتێ)) ، ((یێم)) ، لەهەولێردەڵێن ((دێم)) شێوەی هەولێرڕاستەو
سلێمانی هەڵەیە ، چونکەئەم داله (د) دەبێ بنوسرێت ، کەواتە ((یێم))و((یاومەتێ))هەڵە
یە٠

نموویەکی ترلەسلێمانی دەڵێن : ((ئەوبینم)) ، بەلاّم لەهەولێردەڵێن : ((دەتبینم)) لێرەدا
شێوەی سلێمانی هەڵەیە ، چونکە پیتی (ت) جێناوە دەبێ بنوسرێت یان بخوێندرێتەوە٠

نموونەیەکی تر لەشێوەی هەولێربۆکۆی نزیك ودوور هەردەڵێن : ((ئەوانە)) یان ((ئەوە))
لەکاتێکدا ئەوانە بۆکۆی دوورە ، ئەمانە بۆکۆی نزیکە ، ئەوە بۆتاکی دوورە ، ئەمەبۆتاکی
نزیکە٠واتا بۆنزیك ودوورهەرنیشانەی دوور (ئەوە ، ئەوانە) بەکاردەینن٠

نموونەیەکی تر لەپارێزگای هەولێر دەڵێن : ((هاتووچۆ)) تەنانەت لەسەرتابلۆی ئۆتۆمبێلی
(مرور) دەنووسن (هاتووچۆ) ، (چوو)ڕاستەو(چۆ)هەڵەیە ، چونکەلە(هاتن وچوون)هاتووە٠

نموونەیەکی تروشەی (خەرمان)هەڵەیە (خرمان)ڕاستە ، چونکەلە(خڕ + مان)پێکهاتووە ،
چونکەئەوجێگەیە خڕەوگردە پاشان پاشگری(مان)کردوویەتی بە ناوی شوێن وەکونیشتمان
چونکە(خڕ)واتاکۆ وەك (خڕبوونەوە)٠

نموونەیەکی تر لەپارێزگای هەولێر زۆرجارپێشگری (ڕا)لەپێش کاری (هاتن)بەکاردەینن وە
ك ئەگربلێن لەهەولێرەوهاتووم دەڵێن لەهەولێرەوەڕاهاتیمە ، کەڕاهاتن واتا پەروەردەکران
وفێرکران وخووپێوەگرتن٠

نموونەیەکی تر (هاویشتن ، خستن) هەرکام لەم دوو وشەیە واتای تایبەت وجیاوازیان هەیە هاویشتن بۆکارێکە ئەنجام دانەکەی بۆدووربێت ، لەپارێزگای هەولێرکاری هاویشتن بۆکاری یەکجارنزیك بەکاردەینن وەك ئەگەربلێن پارەکەم خستەناوگیرفانی دەلێن هاویشتمەناوگیر فانی٠

نموونەیەکی تر خواردنی پیتی (د) لەشێوەی سلێمانی وەك لێی بدە دەلێن لێی بە (هەڵەیە) بەلاَم لەشێوەی هەولێریش پیتی (د) لەهەندێ وشەزیاددەکەن وەك : بەجەهەننەم دەلێن : جەهەندەم ، وشەی جەهەننەم لەقورئانی پیرۆزداهاتووە پیتی (د)ی تێدانییە٠یان وشەی - زەماوەند کەلەهەورامی وەرگیراوە لە (زەما + وەن) پێکهاتووە زەما واتا زاوا وەن واتا دەبەن هەردوو وشەکەپێکەوەواتازاوادەبەن بۆلای بووك پیتی (د)زیادەیە٠یان بەدەنووك دەلێن دند ووك ، وشەی دەنووك لە (دەم + نووك) پێکهاتووە واتادەمێك کەنووکی هەبێت٠

نموونەیەکی تر لەپارێزگای هەولێر پیتی (ی) بەناوەوەدەلکێنن وەك : من حەزلەگۆشتی — مریشکی دەکەم٠ (هەڵە)

من حەزلەگۆشتی مریشك دەکەم٠(ڕاستە ووێژەییە)

نموونەیەکی تر (کەڵەباب وکەرەباب) کەڵەباب دروستە وشەی باب واتا نێربوون دەدات٠

نموونەیەکی تر وشەی (پێ وقاچ) وشەی پێ لەفارسی کەلەگەڵ کوردیەك خێزانەزمانن پێی دەلێن (پا) ، بەلاَم وشەی (قاچ) لەتورکییەوەهاتووە ، کەلەتورکی پێی دەلێن (قچ) یان (گچ) لەتورکی ئەگەربلێن ڕاکە یان هەڵێ دەلێن (قاچ) دیارەمرۆڤ بەقاچ هەڵدێ ، کەواتەپێ ڕاستە وقاچ وشەیەکی ڕەسەن نییە لەزمانی تورکییەوەهاتۆتە ناوزمانی کوردی٠ئەم وشانەش نیشا نەی ڕەسەنی وشەی (پێ)یە وەك : (پێمەڕە ، پێلاَو ، پێگە ، پێ پەتی ، پێداگرتن ، پێلێنان ، پێشێل ، ٠٠٠ هتد)٠

نموونەیەکی تر وشەی (تینوو ، تێنوو) تینووڕاستە ، چونکەلەوشەی (تین)ەوەهاتووە ، کەلە کاتی تینی گەرمادا مرۆڤ زیاترتینوودەبێت٠

نموونەیەکی تر پیتی (ع)و(ح) لەهەولێرزیاتر ئەم دووپیتە تێکەڵ بەیەك دەکرێن وەك بە نەعل دەلێن نەحل کە(نەحل) واتا مێش هەنگ یان بەحەسەن دەلێن عەسەن٠

هەندێك وشەبەیەك (و) مانایەك دەبەخشن بەدوو (و) مانایەکی دیکەدەبەخشن بۆنموونە :

**قوت : قوتی کرد واتابڕی**

**قووت : بژێو ، پارووقووتدان**

**کوڕ : نێرینه**

**کووڕ : پشت چەماوه**

**پاشگری (دا) دەبێت سەربەخۆبنووسرێت ونەلکێت بەو وشەیەی لەگەڵی دادێت وەك : له مالآن دا ٠٠٠هتد ، ئەم پاشگرەلەگەڵ ئامرازی دیکەدادێت : (له — دا) (به — دا)٠**

چەندئامۆژگارییێك :

١ – جاری وایە ئیشێك بۆكەسێك دەكەیت ، كەچووی پیاولەماڵەوەنەبوو بەتەنیا لەگەڵ ئا فرەتێك مەمێنەوە و مەچووەژوورەوە ، تادڵنیادەبیت پیاویان لەماڵەوەیە٠

٢ – كەژن و پیاوێك بەیەكەوەدەبینیت ، ڕەنگە ژن و مێرد بن یان خوشك و برابن نابێ گو مان بكەیت ئەمانە دەبێ ئیشیان چی بێت ؟

٣ – كەدووكارمەند لەفەرمانگەیەك كاتێك ژن و پیاوێك مانەوەبەتەنها بادەرگاكە پێوەنەدر ێت یان پەردەكە دانەدرێت٠

٤ – مرۆڤی عاقل پێش ئەوەی شت ڕووبدات ناهێڵێت ڕوبدات بۆنموونە پێش ئەوەی لافاو بێت سەددی بۆدادەنێت ، بەڵام مرۆڤی گەمژە كەشتەكە ڕوودەدات ئینجا چارەسەری بۆدا دەنێت٠

٥ – كۆمەڵە كەسێك دەچن بۆسەردانییێك یان دەعوەتێك ئەگەربەتۆیان نەوتبوو بەگەلیان مەكەوە ، چونكە بەمە شەخصیەتت كەم دەبێتەوە٠

٦ – كابرادوكانداره بۆئەوەی كڕیاربۆلای خۆی ڕابكێشێ دەڵێ : باعایدی خۆم بێ پارەكەمە خە ناوگیرفانتەوە٠

٧ – شتێك بەلاتەوە جوانە وتی : پیرۆزت بێ وەری مەگرە٠

٨ – ڕەخنەلەڕەنگ وشێوازی خانوو مەگرە ، چونكە ئەوەدەكەوێتە سەرئارەزووی كەسەكە٠

٩ – هەندێ كەس دەڵێن : زەكات بدەینە باوكمان ؟ زۆرعەیبە٠

## نەورۆز :

نەورۆز بەچەند ڕەگێکی قوولٚ بەناخی مێژووی کورد دا چۆتە خوارەوە ، وەکو ڕەگی سرو
شت کە گۆڕانی ئاووهەوایە ، خۆشییە ، کامەرانییە٠ڕەگی دووەمیشی ڕەگی نەتەوایەتییە بە
زاڵبوونی کاوەی کورد بەسەرئەژدهاك و ڕازی نەبوونی ئەم نەتەوەیە بەزوڵم و زۆرداری و
خوێنڕشتن٠ئەم ڕاپەڕینەش لەسەرەتای وەرزی بەهاربووە ، هەمووساڵێك بەبۆنەی یادی نە
ورۆز ئاهەنگ دەگێڕدرێت و لەشەوی نەورۆزدا ئاگردەکرێتەوە بەبۆنەی ئەوەی سبەینەکەی
نەورۆزە٠لەناوکوردا گرینگی بەهەردوو ڕەگەکەی نەورۆزدراوە ، بەلاّم لەهەموویان بەهێز
ترڕەگی سروشتە لەپاشان ڕەگی نەتەوەیی٠هەیە دەڵێ : ئەم ڕووداوە لەسەرەتاوە ئەفسانە
یە ، هەشە دەڵێ : نەخێرڕووداوێکی مێژووییە لەدوایی دا هەندێ شتی ئەفسانەیی بۆزیا
دکراوە و ئەفسانەی تێکەڵ بووە ئەفسانەکەش بریتی یە لەمارەکانی سەرشانی ئەژدهاك٠
نوسەروشاعیرانیش بابەتی نەورۆزیان لەشیعرونووسینەکانیان بەکارهێناوە٠

**ڕاڤەی فەرمروودە :**

**یەکەم :** ((ان من أشرالناس عنداللە یوم القیامة ، الرجل یفضي الی المرأة وتفض الیه ثم ینشرسرها))

**واتا : ((خراپترین کەس لای خودا لەڕۆژی دوایی دا ئەو ژن و پیاوەن دەچنەلای یەك دوایی نهێنی یەکتری بلاّودەکەنەوە))٠**

**هەندێ کەسی ئاست نزم باسی سەرجێیی لای خەڵك دەکەن ئەوەش کارێکی دوورلەڕەوشتە٠ وەهەندێ ئافرەت کەباسی جوانی پیاوەکانیان دەکەن لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی ئەوئافرەتانەی باسی جوانی پیاوەکەیان لادەکرێ حەزلەپیاوی باسکراوبکەن٠**

**دووەم :** عن جندب (رضى الله عنه) ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) حدث : (( ان رجلا قال : والله لايغفر الله لفلان ، وان الله تعالى قال : من ذى الذي يتألي على ان لاأغفر لفلان ، فأني قدعفرت لفلان وأحبطت عملك)) رواه مسلم٠ **(فەرموودەیەكی قود سییە)**

**مانای : لەجوندبەوە (خوالێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە ، كەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) باسی ئەوەی كرد ، كەكابرایەك وتی : سوێندبەخوا خودا لەفلاّن كەس خۆش نابێ ، خوای گەورە فەرمووی : كێ یە سوێند بەمن دەخوات ، كەمن لەفلاّن كەس خۆش نابم ، ئەوا من لێی خۆش بووم و كردەوە چاكەكانی تۆش پوچەڵ بۆوە٠**

**مەبەستی فەرموودەكە ئەوەیە ئەگەرخراپەكارێكت بینی بێ هیوای مەكەلەمیهرەبانی خوا وەجاری وایە وتەیەك كردەوەكانی مرۆڤ پوچەڵ دەكاتەوە٠**

سێیەم : ((یاابن ادم انك ان سألتني أعطيك وان لم تسألني غضبت عليك))٠

**واتا : ((ئەی نەوەی ئادەم ئەگەرداوای هەرشتێکم لێ بکەی پێت دەبەخشم ، ئەگەرداواشم لێ نەکەی لێت تورەدەبم))٠نابێ داوای شتێك لەخوای گەورەبکەی یەك دووجارداوای لێ بکە ی دووسێ ڕۆژ دوعای بکەی وازبینی بڵێی دوعام قبول نەبوو ، بەڵکو خوای گەورە پێی خۆ شە زۆرلێی بپاڕێیتەوە بەردەوام بی تاکووەڵامت دەداتەوە٠**

**چوارەم :** ((لعن الله الواشمات والمستوشمات ، والنامصات والمتنصمات والمتقلجات للحسن المغيرات خلق الله)) رواه البخاري عن ابن مسعود٠

**واتا : ((خوانەفرینی کردووە لەوئافرەتانەی خاڵ دەکوتن و ئەوانەش کەبۆیان دەکوتن ، ئە وانەی برۆهەڵدەگرن و ئەوانەش بۆیان هەڵدەگرن ، ئەوانەی بۆجوانی ددانیان شاش دەکەن و دروستکراوی خوادەگۆڕن))٠**

**بەتاقیکردنەوە دەرکەوتووە ، کەلابردنی برۆبەهەڵکەنین وادەکات ئەوموووەی لەشوێنی دێت خێراترگەشەبکات وەك لەگەشە ئاساییەکەی، هەروەها ئەوموووەی دوای برۆهەلگرتن دێتەوە ئەستوورترودڕتروچڕترە لەمووی یەکەم و ناگەڕێتەوە سەرسروشتی یەکەمی٠بەلاّم ئەگەر مووەکە زیادبوو وەك ڕیش و سمێڵی لێ هاتبوو هەلگرتنی هیچی تێدانییە ، چونکە شێواند نی شێوەی ئافرەتە٠هەروەها مووی نێوان هەردووبرۆبەمووی برۆکان دانانرێت٠**

**پێنجەم :** ((يبصر أحدكم القذاة في عين أخيه ولايرى الجذع – أوالجدل- في عينه معترضا))

**واتا :((هی واتان هەیە هیندە بەچاوی ڕەخنە لەبرای موسوڵمانی دەڕوانێت تەنانەت پوشکە لەچاوی بەدی دەکات ، بەڵام درەختێك لەچاوی خۆی دا نابینێت))٠**

الجذل : **یانی داری گەورەوبڵند**

القذاة : **پوشکە**

**ئیبن ئەسیر ، دەڵێ : ئەمە نموونەیەکە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هێناویەتییەوە کەهەندێ کەس هەڵەی بچووکی خەڵکی بەدی دەکات و ڕەخنەیان لێدەگرێت وتوانجیان بۆ داوێت لەسەری لەکاتێك دا بەخۆی هیندە هەڵەوکەموکورتی هەیە ، کەئەگەر بەراوردیان بکەی وەك درەختێکە لەبەرامبەرپوشکەیەکدا٠**

**شەشەم :** ((أنتم أعلم بأمور دنياكم)) رواه مسلم٠

**واتا : ((ئێوەبەكاروباری دنیای خۆتان دەزانن))٠**

**جارێكیان پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بەلای كۆمەڵێك لەیارانی ڕەت بوو دیتی دارخو رما موتوربە(تلقیح)دەكەن ، فەرمووی : ئەگەرئەمەش نەكەن ڕەنگە بەری خۆی بدات ئەوا نیش وازیان لەكارەكەیان هێنا ، كەساڵ سوڕایەوە ئەم دارخورمایانە هیچ بەرێكی ئەوتۆیان نەدا ئەوانیش وتیان : ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) ئێمەلەسەرڕای تۆوا زمان لە تەلقیح كردن هێنا دیوتەهیچ بەرێكی ئەوتۆی نەداوە ؟ درودی خوای لەسەربێ ، فەرمووی :** ((أنتم أعلم بأمور دنياكم)) ٠

**موتوربەكردن بریتییە لەدانانی بەشێك لەڕووەكێك لەسەر ڕوەكێكی ترودروستكردنی ڕوە كێكی تازە٠هۆی موتوربەكردنیش ئەوەیە هەندێ ڕوەك ئاووهەوای شوێنێك بۆی ناگونجێ بۆیەچەندلقێكی لێ موتوربەدەكرێ دەخرێتە سەرڕوەكێك یان ڕوەكێكی تر ، كەبتوانێ لەو ئاووهەوایەدابژی٠هەروەهاموتوربەكردن دەبێتەهۆی جوانكردنی گوڵ وگەڵاوشێوەی ڕوەكە كەودورخستنەوەی ڕوەكەكە لەهەندێ دەردونەخۆشی٠**

حەوتەم : ((المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده)) رواه الخمسة٠

واتا : ((موسوڵمان ئەوکەسەیە ، کەموسوڵمانان لەزمان ودەستی سەلامەت بن))٠

بۆنموونە نابێ شووشەی شکاوفڕێ بدەینە ناوکۆڵان ، چونکە لەوانەیە پێی ڕێبوارێك ببڕێ یان تایەی ئۆتۆمبێلێك پەنچەربکات٠

کەواتە ئیسلام دینی ئاشتییە ، هەتالەکاتی شەڕیش دا تەوجیهی ئەوەیە ژن ومنداڵ وپیرو پەککەوتە نەکوژن و دارنەبڕن ، ئەم ڕێنماییانە وای کرد لەماوەی بیست و سێ ساڵ پێغە مبەرایەتی کەمترین ژمارەی کوژراوهەبن ، کەلەوماوەیەدا تەنها (١٠١٨)هەزار و هەژدەکەس کوژراون ، (٢٥٩)موسوڵمان و (٧٥٩) ناموسوڵمان٠

ئەوکارەنامرۆڤانە ، کەکابرا سەیارەکەی دەتەقێنێتەوە (٢٠٠ – ٣٠٠) کەسی بێتاوانی پێوەدە بێ ، کەئەم کارە لەئاین دا جێی نابێتەوە لەملاوە کەللەی سەری پیاوێك پەڕیوە ، یەکێکی تردەستی پەڕیوە ، یەکێکی ترهەردووقاچی پەڕیوە ، یەکێکی ترچاوەکانی کوێربووە ، یە کێکی ترڕیخۆڵەکانی ڕژاون ، یەکێکی ترهاواردەکات٠هەروەها بەکارهێنانی ناوی ئاینی ، کە صدام ناوی عەبباس و حوسەینی لەموشەکەکانی دەنا لەبەرخۆشەویستی ئەم دوو زاتە نە بووە٠

زمانحالی ئاین تەنیا قورئانی پیرۆزوسوننەتە ، مەرج نییە هەرشتێك بەناوی ئیسلامەوە بو ترێت وتەی ئیسلام بێت ، زۆرکاریش بەناوی ئیسلامەوە دەکرێت پێچەوانەی ئیسلامە٠

(لەساڵی ١٩٦٠ دووڕێکخراوی هیندۆسی بەزۆروایان کرد دووسەد ئافرەتی موسوڵمان جلیان داکەنن و بەڕووتی بەشەقامەکان دا بڕۆن پاشان هێرشیان کردنەسەر لەپێش چاوی خەڵکی تەعەددای ناموسیان لێکردن پاشان هەندێ داریان خڕکردەوە یەك لەدوای یەك دەیانخستنە ناوئاگرەکەوبەدیاریانەوە پێدەکەنین٠وە لەتایلاند حکومەتی بوزی هەڵسابەهەڵمەتێك دژی موسوڵمانان و هەزاران موسوڵمانی بێتاوانی کوشت و دەستیان کرد بەدەرزی لێدان بەئافرە تە موسوڵمانەکان بۆئەوەی سك پڕنەبن و موسوڵمانەکان قڕبکەن وەلە(بۆرما)قەسابخانەیان دژی موسوڵمانەکان داناوە بەچەقۆ دەست و لاقی موسوڵمانەکان لێدەکەنەوە کەمرۆڤ توو – شی شۆك دەبێت٠بەڵام ڕاگەیاندنەکان وەهاباسی ناکەن ، (ڕاشون) لەوتارێکی دا لە (برغ)دا وای لەجولەکەکان کرد بۆبایەخدان بەڕاگەیاندن ، وتی : (ئەگەرئاڵتوون یەکەم هێزمان بێ

**دەبێ ڕۆژنامەگەری هێزی دووەممان بێ)٠**

**هەشتەم :** ((مـاأسفل من الكعبين من الاعزار ففي النار)) رواه النسائي٠

**واتا : ((ئەوکەسەی پانتۆڵەکەی لەخوارگۆزینگییەوەبێ ئەوا لەئاگردایە))٠لەفەرموودەیە کی تر هۆیەکەی دیاری دەکات ، ئەگەرمەبەست فیزولووتبەرزی بێت بەومەبەستە پانتۆ ڵەکەی درێژکردبێ٠درودی خوای لەسەربێ دەفەرمووێ :** ((لاينظر الله الى من جرثوبه خيلاء٠٠٠))٠**واتا : ((خوا(جل جلاله) تەماشای کەسێك ناکات ، کەپۆشاکەکەی بەمەبە ستی شانازی و فیزولەخۆباییەوە بەدوای خۆی دا ڕابکێشێ))٠هۆیەکی تریش کەکاتێك بە شەقامێکی تەڕوقوڕاوی دا دەڕۆی تاپیس نەبێت٠**

**نۆیەم :** ((المتشبح بمالم يعطى كلابس ثوبي زور)) رواه البخاري ومسلم٠

**رۆژێك ژنێك بەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)ی ووت : من سەربەهەوێم خۆقەیدینا کە ئەگەرلای هەوێکەم خۆم هەڵبکێشم و بڵێم مێردەکەم فلاًن شتی بۆکردم بۆشی نەکرد بم ؟ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ((ئەوەی خۆی هەڵبکێشێ بەشتێکەوە نەی بێت و وەری نەگرتبێت وەکوکەسێك وایە کەدووبەرگی درۆی پۆشیبێ)) ٠ چونکە لە لایەکەوە درۆدەکات کەخۆی ئەوشتەی نییە لەلایەکی ترەوە درۆبەدەم کەسێکی ترەوە دە کات کەشتێکی پێی داوە لەڕاستیش دا پێی نەداوە٠**

**دەیەم :** ((استعنوا على النجاح الحوائج بالكتمان ، فاءن كل ذي نعمة محسود)) رواه الطبراني٠

**واتا : ((یارمەتیت دەدا بۆسەرکەوتن بەوەی هەمووشتێ لای هەمووکەس مەڵێن واتا نهێنی ژیانتان و ئیش وکاروکەسابەتتان و گوزەرانی خۆتان لای هەمووکەس باس مەکەن ، لەبەر ئەوەی هەمووخاوەن خۆشی و دەوڵەمەندییێك حەسودی خۆی هەیە))٠**

**بۆنموونە مەڵێ موچەکەم زۆرە ئەوەندە زەوییەم هەیەو سەیارەم ئاوایەو منداڵەکانم زۆر گوێڕایەڵن و لەخوێندن یەکەمن ، چونکە هەیە حەسودەوچاوی پیسە و چاوی پێ هەڵنا یێ و خۆزگە بەلەناوچوونی دەخوازێ٠**

**یازدەیەم :** ((لاتصحب الملائكة رفقه فیها كلب ولاجرس))٠

**واتا : ((فریشتەكانی خوای گەورە هاوڕێیەتی كۆمەڵێك ناكەن یان لەشوێنێك نابن ، كەسەگ و زەنگی لێ بێ))٠**

**ئیمامی نەواوی وتوویەتی : مەبەست لەفریشتەكان، فریشتەی ڕەحمەتە نەك فریشتەی نوو سینی كردەوەكان٠**

**زانایان جیایان كردۆتەوە بەكارهێنانی زەنگی ئاسایی بۆئاگاداركردنەوە ، خواش زاناترە٠ ئەوەی نەشیاوە زۆرجارزەنگ و ئاوازی مۆسیقای مۆبایل لەناومزگەت و ماڵی خوادا لێ دە درێ ، كەدرودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی :** ((الجرس مزامیرالشیطان))

**واتا : ((زەنگ زوڕنای شەیتانە))٠**

**دوازدەیەم :** ((المعدة بيت الداء ، والحمية دواءها))

**واتا : ((گەدە ماڵی نەخۆشییەکانە ، دەرمانەکەشی پاراستنیەتی))**

**واتا پاراستنی لەزۆرخواردن و خواردنەوە و خواردنی پیس و خراپ٠مرۆڤ بەسروشتی خۆی حەزلەخواردن دەکات ، بەلاّم نابێ مرۆڤ هەموو ئامانجی لەخواردن تام و چێژوەرگرتن بێت بۆئەوەی خۆی بپارێزی لەنەخۆشی و قەڵەوی٠**

سێزدەیەم : (( فاءذاكنت في غنمك أوباديتك فأذنت للصلاة فارفع صوتك بالنداء فاءنه لايسمع مدى صوت المؤذن جن ولاانس ولاشيء الاشهدله يوم القيامة ، قال أبوسعيد : سمعته من رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ))رواه البخاري ومسلم٠

**واتا : ((هەركاتێك لای مەڕەكانت بوویت یان لەدەشت بوویت وبانگت دا ، دەنگت زیاتربەرز بكەوە ، چونكە بێگومان هەتاجن و مرۆڤی زیاتر بانگەكەت ببیستن یان هەرشتێكی تر ئە وا لەڕۆژی قیامەت دا شاهیدی بۆدەدەن ، لەپاشان دا (ئەبوسەعیدی خودری) وتی : من ئە مەم لەپێخەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەربێ) گوێ لێ بووە))٠**

**بانگ** (الأذان) **لەزمانەوانی دا واتا ڕاگەیاندن و ئاگاداركردنەوە یان بانگەواز وەك خوای گە ورەدەفەرمووێ :** {وأذان من الله ورسوله الى الناس} التوبة : ٣

**واتا : (ئەمەش بانگەواز و ڕاگەیاندنێكە لەلایەن خواوپێخەمبەرەكەیەوە بۆهەمووخەڵكی)٠**

**بەڵام لەزاراوەدا واتا ئاگاداركردنەوەی موسڵمانان بەهاتنی كاتی نوێژی فەرز وبانگهێشت كر دنیان بۆئەنجام دانی نوێژ٠**

**بانگدان دەبێت بەزمانی عەرەبی بێت وەكونوێژبەزمانی عەرەبی نەبێت نابێت٠سوننەتە با نگ بێژی مزگەوت بانگەكەی لەشوێنێكی بەرزبدات تاوەكوزۆرترین خەڵك گوێیان لێ بێت وەكوسەربانی مزگەوت ، وەلەسەردەمی ئەمڕۆماندا سوودلەئامێری دەنگ بەرزكردنەوە وەر دەگیرێت كەمكەبیرەیە دەنگی بانگەكە زیاددەكات ودەنگی زۆرتردەڕوات ، هەروەها پێویستە بانگ بێژدەنگی خۆش بێت ، هەروەها بەڕاوەستان بانگ بدات٠**

**ئیمامی موسلیم و ئەبوداود ڕیوایەتیان كردووە ، كەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەر موویەتی :** ((اذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول ثم صلوا علي فاءنه من صلى علي صلاة صلى الله عليه بها عشر، ثم سلوا الله لي الوسيلة فاءنها منزلة في الجنة لا – تنبغي الالعبد من عباد الله وأرجوا أن أكون أنا هو فمن سأل لي الوسيلة ، حلت له – شفاعة))

**واتا : ((كەگوێتان لەبانگدەر بوو وەكوئەودەیڵێت بیڵێنەوە ، پاشان صەڵاواتم لەسەرلێ بدەن وداوابكەن لەخوای گەورە درودی خۆیم بەسەردا ببارێنێت ، هەركەسێك صەڵاواتێكی لەسەر لێدام خوای گەورە دە ئەوەندە ڕەحمەتی خۆیی بەسەردا دەبارێنێت ، پاشان دوعام بۆبكەن تاوەسیلەم بەنسیب بێت ، وەسیلە پلەوپایەكی بەهەشتە تەنها بۆ بەندەیەك لەبەندەكانی - خوا (جل جلاله)دانراوە منیش هیوادارم ئەوبەندەیەی خوابم ، هەركەسێك دوعای ئەووە**

**سیلەیەم بۆبکات تابەنسیبم بێت ، شایانی شەفاعەتم دەبێت))٠دوعای وەسیلەش بەم شێوە یەیە :-**

((اللهم رب هذه الدعوة التامة ، والصلاة القائمة ، ات محمدا الوسيلة والفضيلة ، و – ابعثه مقاما محمودا الذي وعدته)) رواه البخاري٠

**واتا : ((هاناخوایە خاوەنی ئەم بانگەوازە تەواوە ، ونوێژپیادەکراوە ، ئەو وەسیلەیەوگەورە ییە بەمحمد(درودی خوای لەسەربێ)ببەخشە ، خوایە ئەوپلەوپایەوڕێزدارەی بەڵێنت پێدا وە بۆی بهێنەدی))٠**

**چواردەیەم :** ((من حفظ على أمتي أربعين حديثا من أمردينها بعثه الله يوم القيامة في زمره الفقهاء والعلماء))

**واتا :((ئەوەی لەئوممەتی من چل فەرمووده لەبارەی ئاینەکەی لەبەربکات ئەواخوای گەورە لەرۆژی دوایی دا لەریزی کۆمەڵی دانایان و زانایان زیندووی دەکاتەوە))٠**

**پازدەیەم :** ((نهى عن الوحدة أن يبيت الرجل وحده ويسافروحده)) رواه أحمدعن ابن عمر ٠

**واتا : ((پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەتەنهابوونی نەهی لێکردووە بەشێوەیەك مرۆ ڤ بەتەنهالەماڵەوەبێت یان بەتەنهاگەشت بکات))٠**

**شازدەیەم :** ((لایكن أحدكم امعة یقول : أنا مع الناس ، ان أحسن الناس أحسنت وان أساءوا أسأت ولكن وطنوا أنفسكم ان أحسن الناس أن تحسنوا وان أساءوا أن تجتنبوا اساء تهم)) رواه الترمذي٠

**واتا : ((كەس لەئێوە وەگەلكەوتە نەبێ بڵێ منیش لەگەڵ ئەوخەڵكە ئەگەر ئەوان چاكەیان كرد منیش چاكەدەكەم ، وەئەگەرخراپەیان كرد منیش خراپەدەكەم ، بەڵكوخۆتان جێگیرو قایم بكەن ئەگەرخەڵكەكەچاكەیان كرد ئێوەبیكەن وەئەگەرخراپەیان كرد ئێوەمەیكەن))٠**

**امعە : واتاوەگەلكەوتە ئەوكەسەیە لەهەموو بیروڕاوكاروبارێك بەگەل كەسانی تردەكەوێت٠**

**حەڤدەیەم :** ((اذاخطب اليكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه الاتفعلوا تكن فتنة في الارض وفسادعريض)) رواه الترمذي٠

**لەم فەرموودەیە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بۆمان ڕوون دەکاتەوە ئەگەرکچمان هە بوویەکێك هاتەداخوازی چ پێوەرێك دابنێین بۆڕازی بوون واتا ئەگەریەکێك خوازبینی کچە کەتانی کرد ئێوەش لەئاین و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا بیدەنێ ئەگەرنەیدەنێ ئەوا فیتنەوئا شووب لەسەرزەوی بلاّودەبیتەوە))٠**

**کەواتە خوازبینیکەرئاین و ڕەوشتی پێوەرە ، کەلەم فەرموودەیەدا ئاین و ڕەوشت پێکەوەها تووە ، چونکە زۆرجاردەشێت یەکێك دینداربێت ، بەلاّم ڕەفتار و هەڵسوکەوتی باش نەبێت بەپێچەوانەشەوە دەشێت کەسێك هەڵسوکەوتی باش بێت ، بەلاّم دینی نەبێت٠**

**هەژدەیەم :** ((القهقهة من الشيطان والتبسم من الله))

**واتا : ((قاقا لەشەیتانەوەیە ، زەردەخەنە لەخواوەیە))**

**ڕووخۆشی و پێکەنین زۆرکات دەلیلەبۆدڵخۆشی ، بەڵام پێکەنین بەدەنگی بەرز بەخراپ باسکراوە٠**

**پەیامبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((خوای گەورەبەدووکەس پێکەنی کاتێك یەکێکیان یەکێکیانی کوشت پاشان خۆی زۆرپەشیمان بۆوە خواهیدایەتی داو تەوبەی کرد خوای گەورەلەقاتیلەکەش خۆش بوو بەیەکەوەچوونە بەهەشت))٠**

## وانەگرینگەکان :

### وانەی یەکەم -  دیاردەکانی نەفامی :

نەزانی لەبەرامبەرزانست نییە ، بەڵکولەبەرامبەر(عەقل)ە ئەوبیروهزرەهەڵەیە کەپەیڕەو
ی لەکرداری پڕوپووچ دەکات، تائێستاش خەڵك لەسەرشتی پڕوپووچ یەکتری دەکوژن وەك:
(پێکەوتنی پڕوشکە ئاوو فوول لایت و ڕاگرتنی سەیارەو٠٠٠هتد)٠
پێش پەیدابوونی ئاینی ئیسلام هەیەکە پشتی خزمی خۆی گرتووە زوڵمی کردبێ یان زو
ڵمی لێکرابێ، ئەگەرکەسێك زوڵمی کرد ئەوە تەواوی هۆزەکەی زوڵمی کردووە ئاینی ئیسلا
م لەبەرامبەریاسای هۆزایەتی ڕاوەستاوحەرامی کرد٠
شانازی هۆزایەتی ڕەفتارێکی تری نەزانی بوو، کەلەبەرامبەرهۆزەکەی ترشانازی پێوەدەکرد
وەکوئازایەتی و ماڵ و سەروەت و ژمارەی ئەندامانی هۆز ، ئەودەیووت هۆزەکەی ئێمە لە
هی ئێوە زیاترە ئەوی تردەیووت هۆزەکەی ئێمە لەهی ئێوە زیاترە بۆیە ئەوخۆهەڵکێشا
نە ڕووی دەدا٠
ئەگەریەکێك لەناوعەرەب دا پیاوێکی بکوشتبا لێپرسراوی دەکەوتە ئەستۆی خزمەکانیشی
ئەم شەڕانەش دا زۆربەیان لەسەرشتێکی بچووك دا هەڵدەگیرسا وەکو لەسەرحوشترێك بۆ
نموونە شەڕێکی خوێناوی بەناوی (داحس) و (غبراء) ، کەدووئەسپ بوون ، داحس هی (
قەیس)ی کوڕی زوهەیرسەرۆکی هۆزی (بەنی فرازە)بوو ، (غبراء) یش هەرهی قەیس بو
و ، بەڵام سەرۆکی بەنی تەغلیب سواربووبوو کێبرکێیان کرد لەئەنجام دا قەیس وتی : من
بردوومەتەوە ، حوزەیفەش وتی : نەخێرمن بردوومەتەوە ، شەڕهەڵگیرساوساڵانێکی زۆری
خایاندو کوشتارێکی زۆرلەهەردولاکەوت٠(ڕیچ دەڵێ : لەناوچەی خۆشناوەتی چەندساڵێك
دوژمنایەتییەکی خوێناوی لەنێوان دووناوچەدا لەسەرسەگێك ڕووی دابوو، کەنزیکەی (٧٠)
حەفتاکەسیان لەیەکتری کوشتبوو٠)
تەنهالەمانگەحەرامەکان (ذی القعدة ، ذی الحجة ، محرم ، رجب)کەپاشماوەی ئاینی حە
زرەتی ئیبراهیم بوو (علیەالسلام) شەڕیان ڕادەگرت ، کەپێیان دەووت : ئاشتی پیرۆز (صلح
المقدس) ئەم هەلە(فرسەت) یان بۆدەرەخسا تاکەمێك پشوو بدەن لەوماوەیە بتوانن بەکاری
بازرگانی و کڕین و فرۆشتن هەڵبستن و زیارەتی کەعبەی پیرۆزبکەن٠ئەگەرشەڕێك لەوما

**نگانه ڕوویدابا ناویان لێ دەنا شەڕی خراپەکاری(حرب الفجار)٠بۆیەخوای گەورەلەسوڕەتی (ئال عیمران)باسیان دەکات و دەفەرمووێ :** { واعتصموابحبل الله جميعا ولاتفرقوا واذ كرنعمت الله عليكم اذكنت أعداء فألف بين قلوبكم فأصبحتم بنعمته اخونا وكنت على شفاحفرة من النارفأنقذكم منها ٠٠٠الى اخرالأية }ال عيمران : ١٠٣

**واتا : (هەمووتان دەست بەدینی خواوەبگرن و پەرت و بلاّومەبن ، یادی نازونیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان ، کاتی خۆی دوژمنی یەکتری بوون بەهۆی ئیسلامەوە دلّەکانتانی پەیوە ست بەیەك کرد و هەمووبوونە برای یەکتری ، هەروەها ئەوکاتە ئێوە لەسەرلێواری چاڵێکی ئاگروەستابوون خەریك بووبکەونە ناوی خوای گەورە لەوئاگرە ڕزگاری کردن)٠**

**یەکێکی ترلەدیاردەکانی نەزانی ڕوانگەیان لەبارەی ژنەوەبوو ، هەبوونی کچ مایەی شەرمە زاری بوو٠هەروەهاکچ و ئافرەتیان لەمیرات بێ بەش دەکرد باوەڕیان وابوو کەسێك هەقی میراتی هەیە ، کەبتوانێ شمشێربوەشێنێ و دیفاع لەهۆزەکەی بکات٠ئەودیاردەیەلەناویاندا هەبوو ئەگەرئافرەت مێردەکەی مرد کوڕی گەورەی پیاوەکە لەژنەکانی ترئەگەرحەزی لێ بێ دەتوانێ زڕدایکی خۆی مارەبکات وەکومیرات وە ئەگەرحەزی لێ نەبوایە لەخۆی مارەی بکات ئەوابەمێردی ئەداومارەییەکەی بۆخۆی وەردەگرت بۆیە قورئانی پیرۆزئەوکارەی قە دەغەکرد ، خوای گەورەدەفەرمووێ :** {ولاتنكحوا مانكح ابائكم من النساء}النساء : ٢٢

**ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆزگێڕاویانەتەوە لەسەرەتای ئیسلام کاتێ کابرایەك مرد کوڕەکەی بڕیاری دا باوەژنەکەی بەهاوسەری خۆی بکات ، لەم کاتەدا ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە :** {لا تحل لكم أن ترثوا النساء ٠٠٠}النساء : ١٩ **واتا : (حەلال نییە ژن بەمیرات بەرن)٠**

**دیاردەیەکی تر زیندەبەچاڵکردنی کچان بووڕوانگەیان وابوو ڕەنگەلەبەگژداچوونەوەی هۆ زایەتی دا بکەوێتە دەستی دوژمن و ببێتەمایەی شەرم بۆئەوهۆزە هۆکارێکی تریش لەبەر باری ئابوری و لەترسی هەژاری کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکرد٠دەگێڕنەوە کابرایەك بەنا وی (ئەبی هەمزە) لەبەرئەوەی ژنەکەی کچی بووبوو لێی توڕەبوو نەگەڕایەوە ماڵەوە چووە ماڵی دراوسێکەیان جاکاتێ ژنەکەی لەگەڵ منداڵەکانی یاری دەکرد ئەم کۆپلە شیعرەی دەو وت:**

مالأبي حمزة لايأتينا
يظل في البيت الذي يلينا
غضبان الانلد البنينا

تالله ماذلك في أيدينا
وانما نأخذ ماأعطينا
ونحن كاالأرض لزارعينا
ننبت ماقدزرعوه فينا

**ماناى :**

**ئەبوحەمزە چییەتی بۆچی نایەتەوە بۆلامان**

**لەماڵی دراوسێ چی دەكات ؟**

**لەبەرئەوەی كوڕمان بۆنەهێنایە بۆیە توڕەبووەلێمان ؟**

**بەخواقەسەم ئەم كارەبەدەست ئێمەنییە**

**ئەوەی كەبەئێمەدراوە وەری دەگرین**

**ئێمەوەكوزەوی كشتوكاڵین بۆجوتیارەكانمان**

**هەرچیمان تیابچێنن سەوزی دەكەین**

**ئەم دیاردەیەی زیندەبەچاڵكردنی كچان زۆرلەناوهۆزی (بەنی تەمیم)باوبوو ، وتراوە یە كەمین جا هۆزی (بەنی تەمیم) ئەم دیاردەیەی داهێنا ، ئەویش كاتێك ئەم هۆزە لەدانی وەرگر(مالیات) بۆ(نوعمانی كوڕی مونزر) پاشای (حیرە) شەڕێك لەنێوانیان دا ڕووی دا ، هۆزی تەمیم شكان و ژنەكان و كچەكانیان بوونە دیلی نوعمان جاكاتێ نوێنەرەكەیان بۆ ئاشتی ناردە لای نوعمان ، تاكچەكان و ژنەكانیان بۆبنێرنەوە ، نوعمان وتی : دیلەكان ئا زادن زۆریان لێناكەین هەركامیان دەگەڕێتەوە بابگەڕێتەوە ، وە هەركامیان لە(حیرە) دە مێنێتەوە بابمێنێتەوە٠كچی (قەیس كوڕی عاسم) ، كەسەرۆكی هۆزی (بەنی تەمیم) بوو لەناودیلەكان بوو مێردی بەیەكێ لەسەرۆكەكانی (حیرە)كردبوو ، مانەوەی لەحیرە هەڵبژا رد و نەگەڕایەوە٠قەیس لەم بڕیارەی كچەكەی زۆرنارەحەت بوو پەیمانی داكەلەمەولاكچی ببێ بیكوژێ ، دەڵێن (١٢) دوازدە تا (١٣) سێزدە كچی خۆی كوشت وردەوردە لەناوهۆزەكانی عەرەب بووەنەریت ، بەلاَم هەندێ لەهۆزەكان و كەسایەتییەكان دژی ئەونەریتە بوون ، لە وانە : عەبدولموتەلیبی باپیری پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)و سەعسەعەوكەسانی تر٠ كەسانێك هەبوون وەك سەعسەعە كاتێ خەڵك لەبەرهەژاری دەیانوویست كچەكانیان زیندە بەچاڵ بكەن لەباوكیان وەریان دەگرتن و بەخێویان دەكردن وەجاری وا هەبوو بەرامبەربە**

**کچەکەنیان حوشتریان دەدا بەخاوەنەکانیان٠پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەیەکەمین پەیمان کەپەیمانی (عەقەبە)یە کەلەگەڵ خەڵکی یەسریب (مەدینە)بەستی یەکێ لەبەندەکا نی پەیمانەکەئەوەبوو : دەست هەلگرن لەزیندەبەچاڵکردنی کچان٠هەروەها دواى فەتحی مە ککە لەکاتی بەیعەت پێکردن دا لەسەرژنان دانابوو ، کەئیترمندالأنی خۆیان نەکوژن، خوای گەورەدەفەرمووێ :** {ياأيهاالنبي اذاجاءك المؤمنات يبايعنك على أن لايشركن بالله شيئا ولايسرقن ولايزنين ولايقتلن أولادهن ولايأتين ببهتان يفترينه بين أيديهن وأرجلهن و لا يعصينك في معروف فبايعهن واستغفرلهن ان الله غفوررحيم} ممتحنة : ١٢

وانەی دووەم - ژیانی پەیامبەرمحمد(درودی خوای لەسەربێ) :

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەشاری مەککەی پیرۆز نزیك صەفا لەماڵی ئەبوتالیب لە٢٠ی نیسانی ساڵی ٥٧٠ی لەدایکبوون هاتۆتەدنیاوە بەرامبەربە١٢ای رەبیعی یەکەمی ٥٣ی پێش کۆچی٠(ئەم ماڵە ئێستا لەشوێنەکەی دا پەرتووکخانە دروستکراوە بەناوی مەککە)٠

دایەنەکانی : سووەییەی ئەسلەمی کەنیزەکی ئەبولەهەب ، پاشان حەلیمەی کچی زوئەیبی سەعدییەی خێزانی حارسی کوڕی عەبدولعوزرا٠براشیرییەکانی : عبداللەی کوڕی جەحش ، حەمزەی مامی ، ئەبولسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدومەسروحی کوڕی سووەییە٠لەحە لیمەسەعدییەوە : عبدالله ، ئەنیس ، حوزافە ، شەیما، کەمنداڵی حاریس بوون٠

مامەکانی : زوبەیر(ئەبوتاهیر) ، ئەبوتالیب (عەبدمناف) ، عەبباس ، زیرار ، حەمزە ، حە جل ، حاریس ، ئەبولەهەب (عەبدولعوزرا) ، غەیدق ، عەبدولکەعبە ، قەسم٠خالەکانی : ئەسوەدی کوڕی یەغوس ، عبداللەکوڕی ئەرقەمی کوڕی یەغوس٠

خێزانەکانی :-

یەکەم - خەدیجە :

خەدیجە کچی خوەیلیدی ئەسەدی عەبدولعوزرای قوسەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕڕە٠دایکی ناوی فاتیمەی کچی زائیدە ، لەساڵی (٦٨) پ ك لەدایکبووە٠لەساڵی (٢٨)پ ك (پێش کۆچی) هاوسەرگیری لەگەڵ پێخەمبەری خواکردووە٠مارەییەکەی بیست وشتری نۆبەرەبوو ، ماوەی هاوسەرگیرییەکەی (٢٥)بیست وپێنج ساڵ بوو٠لەشاری مەککەی پیرۆزلەساڵی (١٠)ی پێخە مبەرایەتی کۆچی دوایی کردووە٠منداڵەکانی لەپێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) : زەینەب ، قاسم ، روقیە ، ئوم کەلسووم ، فاتیمە ، عبدالله (تەیب یاخودتاهیر)٠پێشتردوو جارهاوسەرگیری کردووە ، یەکەم : ئەبوهالە (نەبباشی کوڕی زیرارەی تەمیمی) ، دوومندا ڵی لێی بووە : هیندوهالە ، هەردووکیان موسوڵمان بوون٠دووەم : عەتیقی کوڕی عبیدمە خزومی یەك کچی لێی بووە بەناوی هیند ، ئەویش موسوڵمان بووە٠

دووەم — سەودە :

کچی زەمعەی کوڕی قەیس کوڕی عەبدشەمس٠لەشاری مەککەی پیرۆز لەساڵی (٦٨)ی پ ك لەدایکبووە ، لەساڵی (٣)ی پ ك (پێش کۆچی) هاوسەرگیری کردووە٠پێخەمبەر(درودی خو

ای لەسەربێ) داخوازی کردووە لەدوای وەفاتی خەدیجە هەتا چاودێری منداڵەکانی بۆبکات٠ ئافرەتێکی بەتەمەن بوو لەکۆتایی خیلافەی پێشەوا عوسمان وەفاتی کردووە ، منداڵی لە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) نەبووە٠مێردی پێشووی سەکرانی کوڕی عەمر ، کەلە گەڵی دا کۆچی کردووە بۆحەبەشە لەوێ مردووە ، پێنج منداڵی لێی هەبووە٠

سێیەم – عائیشە :

کچی پێشەوا (ئەبوبەکری صدیق)ە ، لەساڵی (٩)ی پ ك لەدایکبووە٠لە(١)ی کۆچی هاوسەر گیری کردووە ، مارەییەکەی (٤٠٠)درهەم بووە ، ماوەی هاوسەرگیرییەکەی (١١)ساڵ بووە تە نها ئەوکچ بووە ، ئەوانی ترهەمووبێوەژن بوون٠کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)خوا ستوویەتی بووبەهۆی بەهێزبوونی پەیوەندی لەگەڵ وەزیرەکەی داواتا ئەبوبەکری صدیق٠ لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ٥٨ی کۆچی وەفاتی کردووە ، منداڵی لەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)نەبووە٠

چوارەم – حەفسە :

کچی پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب)ە ، لەساڵی (١٨)پ ك لەدایکبووە ، لە (٣)ك هاوسەر گیری کردووە٠ماوەی هاوسەرگیرییەکەی (٨)ساڵ بووە ، بووە هۆی پتەوبوونی پەیوەندی پەیامبەر(درودی خوای لەسەربێ)لەگەڵ وەزیری دووەمی دا واتا(عومەری کوڕی خەتاب)٠ لەڕمەزانی ساڵی (١٤)ك وەفاتی کرد٠مێردی پێشووی لەغەزای ئوحود شەهیدبوو ، پێخە – مبەر(درودی خوای لەسەربێ) تەلاقی دا (یەك تەلاق) ، بەڵام خوای گەورە(جل جلالە)جو برەئیلی ناردە خوارەوە پێی فەرموو : حەفسە بگەڕێنەوە ، چونکە ئافرەتێکی زۆرڕۆژووە وان و باشە وەخێزانی تۆشە لەبەهەشت دا ، هەندێکیش دەڵێن لەبەردڵی ئیمامی عومەر٠

پێنجەم – زەینەبی کچی خوزەیمەی کوڕی حارسی کوڕی عبداللە :

لەساڵی (٢٦) پ ك لەدایکبووە ، لە(٣)ك هاوسەرگیری کردووە ، مارەییەکەی (٤٠٠) درهەم بو وە ، ماوەی هاوسەرگیری (٨) مانگ بووە٠مێردەکەی لەغەزای ئوحود شەهیدبوو ، پەیامبەر خواستی هەتا بەخێوی بکات و سەرپەرشتی بکات٠لە (٤)ك وەفاتی کرد ، مێردی پێشووی – عبداللەی کوڕی جەحش بوو٠

شەشەم – هیند (ئوم سەلەمەی مەخزومی) :

لەشاری مەککەی پیرۆز لە (٣٠)پ ك لەدایکبووە ، لەشاری مەدینە لەساڵی (٤)ك هاوسەرگیری کردووە مارەییەکەی هەندێ کەل و پەلی ناوژوورەکەی٠ماوەی هاوسەرگیری (٧) ساڵ بووە ، لەساڵی (١٦) ك وەفاتی کردووە٠

حەوتەم – زەینەبی کچی جەحش :

دایکی ناوی ئومەییەی کچی عەبدولموتەلیب پوری پەیامبەر(درودی خوای لەسەربێ)واتا زە ینەب کچەپلکی پەیامبەرە (درودی خوای لەسەربێ)٠لەساڵی (٣٠)پ ك لەدایکبووە ، لە (٥)ی کۆچی هاوسەرگیری کردووە ، مارەییەکەی (٤٠٠)درهەم بووە ، ماوەی هاوسەرگیری (٦) ساڵ بووە٠هۆی هاوسەرگیری ، لەسەرفەرمانی خوای پەروەردگار بۆپوچەڵکردنەوەی ئەونەریتە ی ، کەمنداڵی خەڵکی دەکردە منداڵی یەکێکی تر ، کەزەیدی کوڕی حاریسە کرابووبەکوڕی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، لەساڵی (٢٠)ك وەفاتی کرد٠

هەشتەم – جوەیریە کچی حارسی کوڕی ئەبی زیرار :

لە(١٦) پ ك لەدایکبووە ، لە(٥)ك هاوسەرگیری کردووە لەدوای غەزای هۆزی موستەلەق ، مارەییەکەی (٤٠٠) درهەم بووە ، ماوەی هاوسەرگیری (٦) ساڵ بووە٠کچی سەرۆکی هۆزی موستەلەق بووە کەحارسی یەهودی بووە لەبەرخاتری ئەم ئافرەتە تێکڕای دیلەکان ئازاد کران ، چونکە پەیامبەربووە زاوای ئەم هۆزە خەڵکی وتیان چۆن دەبێ خزمانی پەیامبەر دیل بن لای ئێمە ئەوەبوو تێکڕای دیلەکان ئازادکران ، ئافرەتێکی ڕۆژووەوان وخواپەرست بوو ، لەساڵی (٥٦)ك وەفاتی کرد٠

نۆیەم – صەفیە :

کچی (حوڕی کوڕی ئەختەب)ە ، لە(١٠)پ ك لەدایکبووە ، لە(٧)ك هاوسەرگیری کردووە ، ما رەییەکەی ئازادکردنی بوو ، کەلەغەزای خەیبەرگیرا٠ماوەی هاوسەرگیری (٤)ساڵ بوو ، کچی گەورەی هۆزی بەنی نەزیربوو ، پەیامبەرسەرپشکی کرد لەنێوان ئازادکردن یان شووی پێ بکات ئەویش شووکردنی هەڵبژارد ، پەیامبەرئازادی کردوهۆزەکەشی لەسەرزەوی و زاروما ڵ وحاڵی خۆیان هێشتەوە ، لە(٥٠)ك وەفاتی کرد٠

دەیەم – ڕەملە (ئوم حەبیبە) :
کچی ئەبوسوفیان بوو ، لە(٣٠)پ ك لەدایکبووە ، لەساڵی (٧)ك هاوسەرگیری کردووە ، مارە
ییەکەی (٤٠٠)درهەم بووە ، کەنەجاشی دایبووی٠ماوەی هاوسەرگیری (٤)ساڵ بوو ، لەساڵی
(٤٤)ك وەفاتی کرد٠هیجرەتی کردووە بۆحەبەشە لەگەڵ هاوسەرەکەی ، بەڵام مێردەکەی لە
حەبەشە بووە گاورو هەرلەوێش مرد٠
یازدەیەم – مەیموونە :
لەپێش دا ناوی بوررە بووە پەیامبەرناوی نا مەیموونە ، لەساڵی (١٨) پ ك لەدایکبووە٠
لە (٧)ك هاوسەرگیری کردووە ، مارەییەکەی (٤٠٠)درهەم بووە، کە(عەبباس)ی مامی پێخە
مبەر(درودی خوای لەسەربێ)داویەتی٠ماوەی هاوسەرگیری (٥)ساڵ بوو ، لەساڵی (٥١)ك وە
فاتی کرد٠
دوازدەیەم – ماریەی کچی شەمعون :
لەسەعیدی میسرلەشاری ئەسیوت لەدایکبووە ، لە(٧)ك هاوسەرگیری کردووە ، کوڕێکی لە
پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بووە بەناوی ئیبراهیم ، لەساڵی (٦١)ك وەفاتی کرد٠
منداڵەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) :
یەکەم – زەینەب :
لەشاری مەککەی پیرۆز لەساڵی (٢٣) پ ك (پێش کۆچی) لەدایکبووە٠لەشاری مەککەی پیرۆز
هاوسەرگیری لەگەڵ ئەبولعاس کوڕی ئەلرەبیع کەکوڕی پورەهالەی کچی خوەیلیدبووە٠لەسا
ڵی (٨)ك لەشاری مەدینەی منەوەرە وەفاتی کرد ، ماوەی ژیانی (٣١)ساڵ بوو٠
منداڵەکانی زەینەب :
١ – عەلی (بەمنداڵی مردووە)٠
٢ – ئومامە : هیچ منداڵی نەبووە٠
دووەم – قاسم : بەمنداڵی مردووە٠
سێیەم – روقیە :
ناوی هاوسەرەکەی عوتبەی کوڕی ئەبی لەهەب بووە ، پاشان شووی کردووە بەئیمامی عو
سمان یەك کوڕی لێ بووە بەناوی عبدالله ، عبداللەش بەمنداڵی مردووە٠لەشاری مەدینە

**لەساڵی (٢)دووی کۆچی وەفاتی کرد ، ماوەی ژیانی (٢٤) ساڵ بوو٠(عوتبە لەڕزگارکردنی مەککە موسوڵمان بوو)**

**چوارەم — ئوم کەلسووم :**

**لەشاری مەککەی پیرۆز لە (١٩) پ ك لەدایکبووە ، هاوسەری عوتەیبەی کوڕی ئەبی لەهەب بووە ، پاشان ئیمامی عوسمان خواستی ، منداڵی لێ نەبووە ، لەساڵی (٩)ك وەفاتی کرد ، ما وەی ژیانی (٢٨)ساڵ بوو٠(عوتەیبە بەبێ باوەڕی مردووە)**

**پێنجەم — فاتیمەی زەهرا (دارەگوڵ) :**

**لەساڵی (١٨) پ ك لەشاری مەککە لەدایکبووە ، لە ساڵی دووی کۆچی هاوسەرگیری لەگەڵ پێشەوا عەلی کردووە ، منداڵەکانی :**

**١ — حەسەن**

**٢ — حوسەین**

**٣ — موحسین (بەمنداڵی مردووە)**

**٤ — ئوم کەلسوم**

**٥ — زەینەب**

**ماوەی ژیانی (٢٩) ساڵ بووە٠**

**شەشەم — عبدالله (تەیب یاخود تاهیر) : بەمنداڵی مردووە ، ماوەی ژیانی کەمترلەساڵێك بووە٠**

**حەوتەم — ئیبراهیم : لەساڵی (٨)ك لەمەدینە لەدایکبووە ، لەساڵی (١٠)ك وەفاتی کردووە ، ماوەی ژیانی ساڵێك و هەشت مانگ بووە٠**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەساڵی فیل لەدایکبووە ، ئەوساڵەی کە(ئەبرەهە)ی پا شای حەبەشە هێرشی تێداهێنایە سەرمەککە ، ئەم لەشکرە فیلێکی زۆریان لەگەڵ خۆیان هێنابوو بۆڕوخاندنی کەعبە٠کەلەشکرەکە گەیشتە نزیك شاری مەککە خوای تەعالاچەند پۆلەباڵندەیەکی ناردەسەریان کەهەریەکەیان قوڕێکی سورکراوەی ڕەقی بەدەنووکییەوە هە لگرتبوو فڕێیان دەدایە خوارەوە بەسەرلەشکرەکە ، سوپاکەپەرش وبڵاوبۆوەوخوای گەورە کەعبەی ڕزگارکرد٠**

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کەتەمەنی گەیشتەچل ساڵ خوای گەورەوەحی بۆناردو کردی بەپێخەمبەر.

لەوسەردەمەدا خەڵکەکە بەردی داتاشراویان دەپەرست بتیان دەپەرست سەریان لێدەدان و دیارییان بۆدەبردن و قوربانییان بۆدەکردن.درودی خوای لەسەربێ پێی ڕاگەیاندن کەوائە م بتانە بەردن هیچ سوودوزیانێکیان پێناکرێ وئەوەی دەبێ بیپەرستن خودای تاك وتەنیا یە ناوی (الله)یە جائەوانەی باوەڕیان پێی کردوپێی دەکەن پێیان دەوترێ موسوڵمان هەر کەسێ باوەڕی بەوە هەبێت کەلەقورئان دا نوسراوە یان پەیامبەر(درودی خوای لەسەربێ) ڕایگەیاندوون موسوڵمانە.

خوای گەورە پێخەمبەری ناردووە بۆسەرهەمووخەڵك ئاینی ئیسلامی لەلایەن خواوە بۆ — هێناوین کەلەهەمووئاینەکان چاکترەوبۆچاکبوونی مرۆڤە ، بانگی خەڵکی دەکات بۆخۆشە ویستی یەکتر و بەزەیی هاتنەوە بەیەکتر و لەگەڵ یەك ڕاست بن و هەمووکردارەچاکەکان.

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەساڵی فیلەکەلەدایکبووە لە١٢ی ڕەبیعی یەکەم لەساڵی ٥٧١ی میلادی.پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هێشتالەسکی دایکی دابوو ، کە(عبدالله) ی باوکی کۆچی دوایی کرد و عەبدولموتەلیبی باپیری گرتییە ئەستۆی و بەخێوی کرد.

لەوسەردەمەدا بەگوێرەی داب و نەریتی خەڵکی مەککە منداڵەکانیان دەناردەلای دایەن لە (دەشت) بۆئەوەی لەشساغ وزمان پاراوبن ، حەلیمەی سەعدیە بووبەدایەنی کەلەخێلی بە نی سەعدبوو شیری خۆی دەدایێ.کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)تەمەنی گەیشتە - شەش ساڵان ئامینەی دایکیشی کۆچی دوایی کرد.لەتەمەنی هەشت ساڵی دا عەبدولموتەلیبی باپیریشی کۆچی دوایی کرد ، ئەبوتالیبی مامی بردیەلای خۆی و بەخێوی کرد لەگەڵ خۆی دەیبردبۆشام بۆبازرگانیکردن.پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەهەمووئیش وکارێك دا ڕاستگۆودەستپاك بوو بۆیەبە(الصادق الامین) ناویان دەبرد واتا (ڕاستگۆودەستپاك) بەم جۆ رە ناوبانگی چاکی بەناوخەڵکی دا بلاْوبۆوە خەڵکەکەخۆشیان دەویست و متمانەیان پێدەکر د وشت ومەکی خۆیانیان بەئەمانەت لای دادەنا.کەتەمەنی گەیشتە بیست وپێنج ساڵان خە دیجەکچی خوەیلیدی هێنا.(فاتیمەی کچی ئەسەد هاوسەری ئەبی تالیب ومامۆژنی پێخەمبە ر(درودی خوای لەسەربێ) ئافرەتێکی باش بوو وەکودایکێکی دڵسۆزبوو بۆپێخەمبەر(درودی

خوای لەسەربێ)٠

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هەمووجارێ دەچووە ئەشکەوتی (حیرا) کەئەشکەوتێکە لەچیای (حیرا)لەوێ دادەنیشت وخواپەرستی دەکرد کاتێك کەخودا ویستی بینێرێت بۆسەر خەڵك جوبرەئیلی لەشێوەی پیاوێك دانادەلای وجوبرەئیل سورەتێکی قورئانی بەسەردا — خوێندەوە ، کەگەڕایەوە ماڵەوە خەدیجەی خێزانی بردییەلای (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)ی ئامۆزای وەرەقە کابرایەکی شارەزابوو لەدەنگ و باسی پێخەمبەران کەڕووداوەکەی بۆگێڕا یەوە وەرەقە پێی وت : تۆدەبیتە پەیامبەر٠

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەپێشان دا ماڵ وخێزانی خۆی بانگ کرد بۆموسوڵما — نێتی٠یەکەم کەس کەباوەڕی بەپێخەمبەری خواکرد خەدیجەی هاوسەری بوو لەپیاوانیش ئەبوبەکری صدیق و عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زەیدی کوڕی حاریسەبوون٠

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) تاسێ ساڵ بەنهێنی بانگەوازی کرد ئینجا درودی خوای لەسەربێ دەستی کرد بەبانگکردنی خەڵك بۆموسوڵمانییەتی بەئاشکرا٠ڕۆژێك خەڵکەکەی هەمووخڕکردەوە لێی پرسین :

ئەگەرپێتان ڕابگەیەنم کەواکۆمەڵە سوارێك هاتوون دەیانەوێ هێرش بهێننەسەرتان باوەڕم پێدەکەن ؟

وەڵامیان دایەوە : دیارەباوەڕت پێدەکەین هەرگیزدرۆمان لێت نەبیستووە٠

درودی خوای لەسەربێ فەرمووی : دەسا خوامنی ناردووە بۆسەرئێوە وبۆسەرهەمووخەڵك ، تاپەیامی خوداتان پێ ڕابگەیەنم ، هەروەها فەرمانی پێکردووم داواتان لێ بکەم دەستبە رداری بتپەرستی ببن٠

کافرەکانی قورەیش تووڕەبوون لەناوخۆیان دا ڕێککەوتن کەوائەبوتالیبی مامی پەیامبەر ( درودی خوای لەسەربێ) ئاگاداربکەنەوەوپێی بڵێن کەواداوای لێ بکات وازلەم خەڵك بانگکر دنە بۆئاینێکی نوێ بهێنێت٠بەڵام پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەسەربانگەوازی خۆ ی هەربەردەوام بوو ، کافرەکانیش دەستیان کردبەئازاردانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەتایبەتی پاش وەفاتی (ئەبی تالیب)ی مامی٠ئازاردانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ویارانی لەلایەن قوڕەیشییەکانەوەپەرەی سەند ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فە

رمانی دا بەموسوڵمانەکان کۆچ بکەن بۆمەدینەموسوڵمانەکانیش دەستیان کرد بەکۆچکردن بۆمەدینە کافرەکان کەئەمەیان دی خڕبوونەوە و لەناوخۆیان ڕێککەوتن کەوا لەهەرهۆزێك پیاوێکی ئازا هەڵبژێرن تاهەموویان بڕۆن پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بکوژن٠ئەوشە وە درودی خوای لەسەربێ لەگەڵ ئەبوبەکری هاوڕێی مەککەیان بەجێهێشت بێئەوەی کەس بیانبینێت ، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجێگەی پێخەمبەردا نووست کە سبەینێ ڕۆژبۆوە زا نیان پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) مەککەی بەجێهێشتووە شوێنپێی پێخەمبەروهاوڕ ێکەیان هەڵگرت تائەشکەوتێك لەچیای سەور (ثور) بەڵام نەچوونە ناوئەشکەوتەکە٠

ئیمامی ئەبوبەکر(خوالێی ڕازی بێ) کراسەکەی خۆی دڕاند و کونەکانی ناوئەشکەوتەکەی گرت ئینجابانگی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)کردوپێی وت : سەرت لەسەرڕانم دانێ یەك کون مابوو پێی خۆی لەسەردانا تاماربەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)وەنەدا ، جا ماربەپێی ئیمامی ئەبوبەکری وەدا ، بەڵام پێشەوا ئەبوبەکر(خوالێی ڕازی بێ) خوی تێکنە دا نەوەك پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) خەوەکەی لێ تێك بچێ ، بەیانی کەهەڵسان — پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چارەسەری بۆکرد و خوای گەورە شیفای بۆنارد٠ئینجا بەڕێکەوتن بۆشاری مەدینە پاش ئەوەی گەیشتنە مەدینە خەڵکی بەخۆشی و شادی هاتنە پێشوازییانەوە٠

ئەوموسوڵمانانەی لەمەککە کۆچیان کردبۆمەدینە پێیان دەوترێت : کۆچکردووەکان (مها - رین) ، دانیشتوانی مەدینەش کەیارمەتی موسوڵمانەکانیان دا پێیان دەوترێت پشتیوانان (الانصار) لەوێ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) عەشیرەتی ئەوس وخەزرەجی ئاشت کر دەوەوکردنی بەبرای یەکتری کەپێشترناکۆك بوون٠لەدوای ڕزگارکردنی شاری مەککە وپاککر دنەوەی نیمچەدورگەی عەرەبی موسوڵمانەکان ڕوویان لەناوچەکانی تری جیهان کرد بۆبڵاو کردنەوەی ئاینی ئیسلام٠

**وانەی سێیەم - ئازاردانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) :**

**ڕۆژێکیان پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) نوێژی دەکرد سەری لەسەرزەوییەکە لەکڕنۆ ش دا بۆخوای تاك و تەنیادانابوو ، عوقبەی کوڕی ئەبوموقیت هات کەناوسکی ئاژەڵی پێبو و فڕێی دایە سەرشانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، پێخەمبەریش(درودی خوای لە سەربێ) سەری لەسەرسوجدەکە بەرزنەکردەوە فاتیمەی کچی هات و ناوسکی حەیوانەکەی لەسەرپشتی باوکی لابرد دوعای لەوکەسەکرد کەئەوکارەی ئەنجام دابوو٠**

**جارێکی ترپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەحیجری کەعبە نوێژی دەکرد ، عوقبەی کوڕی ئەبوموقیت هات و جلەکەی ئالاَند لەملی پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر بەتوندی ڕای دەکێشا بۆئەوەی بیخنکێنێ ، ئیمامی ئەبوبەکر(خوای لێ ڕازی بێ) جلەکەی لەملی پیرۆزی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کردەوە و پاڵی بەعوقبەوە ناو لە پێخە ری دوورخستەوە و وتی : ئایا تۆپیاوێك دەکوژی ، کەدەڵێ : (الله)خوامە ؟**

وانەی چوارەم - موسوڵمانبوونی حەمزەی مامی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) :
ڕۆژێکیان ئەبوجەهل لە(صەفا)بەلای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) تێپەڕی قسەی نا بەجێی بەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)وت ، بەڵام پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) وەڵامی نەدایەوە٠حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب لەکەسی قبول نەدەکرد ، عبداللەی کوڕی جەدعان چوو ئەوهەواڵەی بە(حەمزە)دا ، (حەمزە)چوولەوێ ئەبوجەهل لەناوکۆمەڵێك دا نیشتبوو حەمزە کەوانەکەی بەرزکردەوە زۆربەهێز پیای دا کێشاو پێی ووت : چۆن دەتوا نی قسەی پێ بڵێی؟منیش لەسەردینەکەی ئەوم ، ئەبوجەهل بێ دەنگ بوو ، حەمزەش مو سوڵمان بوو٠

**وانەی پێنجەم - پەیمانی یەکەمی عەقەبە :**

**عەقەبە بەمانای هەورازە دەکەوێتە کۆتایی مینالای ڕاستی مەککە٠ژمارەیەك کەس لەخە — لکی یەسریب لەگەڵ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)پەیمانیان بەست وبەیعەتیان کرد ، کەهاوبەش بۆخوادانەنێن و دزی نەکەن و زینانەکەن و منداڵانی خۆیان نەکوژن ، پێخەمبە ریش(درودی خوای لەسەربێ) بەڵێنی بەهەشتیان پێدەدات ئەگەرئەوپەیمانە ئەنجام بدەن٠**

**وانەی شەشەم - شەڕی حونەین :**

**لەدوای ئەوەی مەککە ئازادکرا عەرەبەکان کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە ناوئیسلامەوە، هەوازن لە دوای قورەیش هۆزێکی گەورەبوون ، مالیکی کوڕی عەوف کەگەورەی هەوازنییەکان بوو بە نیازی شەڕکردن لەدژی پێخەمبەری خوا(درودی خوای لەسەربێ)ڕێگای گرتەبەر پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆیان ڕۆیشتەدەرەوە ، کەدووهەزارکەسی خەڵکی مەککەی لەگەڵ دابوو ، هەروەها دەهەزارکەسیشی لەگەڵ دابوو کەلەمەدینە لەگەڵیان هاتبوون ، موسوڵمانە کان سوپاکەیان سەرسامی کردبوون ئەوەندە زۆربوون ، گوتیان ئێمە بەو لەشکرە گەورەیە سەردەکەوین٠**

**رلەشکری ئیسلام کەبەرەو(دۆڵی حونەین) ، کەهەڵدێرێکە نزیك شاری (تائیف)سەرەولێژبو ونەوە لەپڕدوژمن لەکەمین دەرچوون کەوتنەگیانی سەربازانی ئیسلام٠ موسوڵمانەکان سەر یان لێ شێواو کشانەوە تەنیاصەدکەسێك لەگەڵ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)مانەوەو شەڕیان کرد ، بەلاَم دواتردوای بانگکردنیان هەلاَتووان گەڕانەوە دووبارەکۆبوونەوە لەدەور ی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، خوای گەورە لەشکری (هوزان)ی زۆرخراپ تێکشکا ندوچەندین هەزارنەفەریان لێ بەدیل گیرا لەسەرەتاموسوڵمانەکان شکان،بەلاَم دواترسەرکەو تن بەیارمەتی خوای گەورە :** {لقدنصركم الله في مواطن كثيرة ويوم حنين اذا أعجبتكم كثرتكم فلم تغن عنكم شيئا وضاقت عليكم الأرض بمارحبت ثم وليتم مدبرين ثم أنزل الله سكينته على رسوله وعلى المؤمنين وأنزل جنودا لم تروها وعذب الذين كفروا ذ لك جزاء الكافرين }التوبة : ٢٥ ـ ٢٦

**هەوازنییەکان ژن و منداڵیشیان لەگەڵ خۆیان بەرێخست ، لەناوئەودیلانەدا شەیمای کچی کچی حەیلمەتوسەعدیەی تێدابوو ، کەشیرخوشکی پێخەمبەری خوابوو ( درودی خوای لە سەربێ) نەیان ناسیبوو ئەویش بەموسوڵمانەکانی وتبوو من شیرخوشکی پێخەمبەرم (درو دی خوای لەسەربێ) ، بەلاَم باوەڕیان پێنەکردبوو هەتاهێنایانە خزمەت پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) ، شەیما وتی : من شیرخوشکی تۆم ، کەمنداڵ بوویت بەکۆڵ هە ڵم گرتی تۆش بەقایم گازێکت لەپشتم گرت٠ درودی خوای لەسەربێ بەبیری هاتەوە جبە کەی بۆڕاخست و لەسەری دانیشت ، وەسەرپشکی کردوپێی فەرموو : ئەگەرحەزدەکەی لە لای ئێمە بمێنەوە ڕێزلێگیراودەبی ، وە ئەگەرپێشت خۆشە ئەوا کەل و پەلەکانت دەدەمێ**

بگەڕێوە ناوقەومەکەت ، شەیماش موسوڵمان بوو٠

هەوازنییەکان هاتنە خزمەت پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەلایەکی مزگەوت چادری بۆهەڵدان و موسوڵمان بوون٠داوایان لەپێخەمبەر(درو دی خوای لەسەربێ)کرد ئەوبتەکەناویان نابوو(لات) وازی لێ بێنێ بۆیان تاماوەی سێ ساڵ لەلایان بمێنێ ، درودی خوای لەسەربێ بەرپەرچی داواکەیانی دایەوەورازی نەبوو٠ئەمجارە داوایان کرد ، کەساڵ ناساڵێك بتەکەیان لابێت ، درودی خوای لەسەربێ ڕازی نەبوو ، ئەمجا رە داوای ئەوەیان لێکرد ، کەلەهاتنیانەوەبۆماوەی یەك مانگ (لات)یان بۆبمێنێ ،درودی خو ای لەسەربێ ڕازی نەبوو٠هەروەها داوایان کرد کە لەنوێژکردن لێیان ببورێ و نوێژنەکەن ، درودی خوای لەسەربێ فەرمووی خێرلەدین دا نییە ئەگەرنوێژی تێدانەبێت٠کاتێ کەنوێنە رەکانی هەوازن گەڕانەوە،درودی خوای لەسەربێ ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب وموغەیرەی کو ڕی شوعبەی لەگەڵ دا ناردن ، موغەیرە بتەکانی شکاندوئیسلام بلاّوبۆوە هەتاکوئاخیرکەس لە(تائیف)موسوڵمان بوون٠

**وانەی حەوتەم - شەڕی تەبوك :**

**ئەوجەنگە لەمانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی كۆچی ڕووی دا ، لەگەرماییەكی زۆربەهێزدابوو پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەسێ هەزاركەسەوە لەمەدینە ڕۆیشتەدەرەوە بەرەوتە بوك كەوتە ڕێ٠ئەوجەنگە كۆتاجەنگ بوو ، كەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەشدار ی تێداكرد ، كەگەیشتە بیست و حەوت غەزا ، كەدرودی خوای لەسەربێ بەشداری تێداكرد بەهەمووئەوغەزایانەی ڕوویان دا ، ژمارەی كوژراوانی هەردوولا لە (١٠١٨) هەزاروهەژدە كە س زیاترنەبوون٠**

**تەبوك ناوچەیەكە لەنێوان مەدینە و دیمەشق حەوت فەرسەخ لەمەدینەوە دوورە لەوكاتەدا كەوتبووە سەرزنجیرەسنوری ئیمپڕاتۆری ڕۆم و بەرەوشام و مەسیحی نشین بوون ، بەلاّم ئە مڕۆ تەبوك یەكێ لەشارەكانی ولاّتی سعودیەیە و لەنزیك سنوری ئوردنە و (٦٠٠)كم لەمەد ینەوەدوورە٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ڕایگەیاند مەبەستی تەبوكە كەخەڵكی خۆ یان ئامادەبكەن كەوتنەڕێ لەبەرامبەرئەوهەرەوەزی و هاوكارییەگەورەیەی موسوڵمانان دوو ڕووەكان نەك هەرلەگەڵ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) نەچوون ، بەڵكوهەوڵیان دەدا بەبیانووی هەواگەرمی یەوە خەڵكی پەشیمان بكەنەوە لێرەدا ئایەتی قورئان بۆزەمكردنیان دابەزی :** {٠٠٠قل نارجهنم أشدحرا لوكانوا يفقهون}التوبة : ٨١

**هەندێ لەموسوڵمانەكانیش بەبێ بیانوو لەگەڵ جەنگاوەرانی ئیسلام نەچوون و لەمەدینە بەجێمان قورئان ناویان بە(موخەللەفوون) دەبات یانی (دواكەوتووەكان) ، خوای گەورە دە فەرمووێ :** {فرح المخلفون بمقعدهم خلاف رسول الله وكرهوا أن يجاهدوا بأموالهم و أنفسهم في سبيل الله }التوبة : ٨١

**هەندێكی تریش حەزیان لەغەزاكردن بوو ، بەلاّم لەبەرنەبوونی چەك و كەل و پەلی سەر بازی نەیانتوانی بەشداری لەوسەفەرەبكەن٠**

**وانەی هەشتەم - شەڕی موئتە :**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) مارن کوڕی عومەیری ئەزدی بەنوسراوێك نارد بۆلای شەرحەبیلی کوڕی عەمری کوڕی عەسسان ، کە فەرمانڕەوای (بوصڕا)بوو ، وە سەربەقە یسەری پاشای ڕۆم بوو٠نوێنەرەکەی پێخەمبەری خوایان گرت و کوشتیان کە باوونەریت وەهابوو نوێنەرونێرراولای هیچ پاشایەك نەکوژرێت٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کاتێ ئەوهەواڵەی بیست موسوڵمانان خۆیان ئامادەکرد کەژمارەیان دەگەیشتە (٣٠٠٠)سێ هەزارکەس٠**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەشکرێکی نارد بۆناوچەی موئتە و سەرکردایەتی ئەو لەشکرەی بەسێ نەفەریەك لەدوای یەك ڕاسپاردبوو یەکەم : زەیدی کوڕی** حارثە **دووەم : جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب سێیەم : عبدالله کوڕی ڕەواحە بۆیە سێ سەرکردەی دانابوو ئەگەرهاتوو یەکەم شەهیدبوو دووەم ، دووەم شەهیدبوو سێیەم فەرماندەیی بگرێتەدەست٠ لەشکری ئیسلام لەنزیك دێی موئتە کەدەکەوێتە باشوری وڵاتی ئوردن لەپارێزگای (کەرەك) کە(١٣٥)کم لەعەممانی پایتەخت دوورە لەگەڵ لەشکری سەد هەزار سەربازی ڕۆم ڕووبەڕوو بوونەوە هەرسێ سەرکردە یەك لەدوای یەك شەهیدبوون پاشان سەربازانی ئیسلام خالیدی کوڕی وەلیدیان بەفەرماندەیی خۆیان هەڵبژاردو ئەویش فەرمانی کشانەوەی داو بەرەومەد ینەگەڕانەوە٠**

**وانەی نۆیەم - لەشکری ئوسامە :**

**ئەولەشکرەبەفەرماندەیی ئوسامە کوڕی زەیدی کوڕی حارثە بوو ، کەتەمەنی بیست ساڵ نەدەبوو٠زەیدی کوڕی حاریسە یەکێ لەوسەرکردانەبوو ، کەلەشەڕی موئتە شەهیدبوون٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)لەکاتی گەڕانەوەی لەحەجیماڵئاوایی هەوڵی ڕێکخستنی لەشکرێکی دا بەفەرماندەیی ئوسامەکوڕی زەیدی کوڕی حاریسە داوای لێکردن تاسەرزەوی ( ئوبنا) کەناوچەیەکە لەسنوری سوریا دەکەوێتە نێوان عەسقەلان و ڕەملە لەنزیك موئتە بڕوات ئەوشوێنەی کەباوکی تێداشەهیدکرا لەگەڵ ڕۆم بەشەڕبێت٠پێخەمبەر(درودی خوای لە سەربێ) بەدەستی موبارەکی خۆی ئالأی فەرماندەیی دا بەدەستی ئوسامەوە٠**

**وانەی دەیەم - سیفەتەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) :**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هەرلەمندالّی یەوە بەئەدەب بوو ، فەرموویەتی : ((خو دا (جل جلاله) خۆی ئەدەبی داوم ، چاکترین ئەدەبی داوم))٠**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کەقسەی کردبێ ڕاستی وتووە ، کەبەڵێنی دابێت هێناو یەتییەدی ، کەکەسێك ئەمانەتێکی لادانابێت بەتەواوی داویەتییەوە دەستی٠هەروەها پێخە مبەر(درودی خوای لەسەربێ) خۆی لەکەس بەگەورەتر دانەدەنا کەل وپەلی خۆی بەخۆی هەڵدەگرت٠**

**وانەی یازدەیەم - سەردەمی ڕاشیدین :**

**خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری صدیق (خوای لێ ڕازی بێ) ناوی خۆی (عبدالله)یە ، ناسناوی (صدیق)ە ، چونکە هاوبەش دانەرەکان چوون بۆلای پێیان وت : هاوڕێکەت واگومان دەبات کەئەمشەوشەوڕەوی پێکراوە بۆ(بیت المقدس)، ئەویش وتی : ڕاست دەکات بۆیە پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ناسناوی (صدیق)ی پێبەخشی واتا(ڕاستگۆ)٠**

**ئەبوبەکریەکەم کەس بووە لەپیاوان موسوڵمان بووە٠ئیبن عساکر بەسەنەدێکی سەحیح لە عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ : ئەبوبەکرلەسەردەمی نەزانیش دا ئارەقی نەخواردۆتە وە٠تەبەرانی لە** (أوسط)**دەریهێناوە لەپێشەواعەلی یەوە (خوای لێ ڕازی بێ)وتوویەتی : بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەرگیز لەچاکەدا پێشی ئەبوبەکر ناکەوەمەوە ، ئەبوبەکر بۆ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)وەکو وەزیربووە هەمیشە ڕاوێژی پێکردووە لەکاروبارەکا ن دا دووهەمی بووە لەموسوڵمان بوون دا ، دووەمی بووە لەئەشکەوت دا ٠٠٠ خوای گەورەدە فەرموێ :** {ثاني اثنين اذهما في الغار} **ئەم ئایەتەلەسەرپێشەوا ئەبوبەکرهاتۆتەخوارەوە٠ ئەوەی لەسەردەمی خەلافەتی (ئەبوبەکر)دا ڕووی دا کاتێك کەپێخەمبەر (درودی خوای لە سەربێ) وەفاتی کرد هەندێ لەعەرەبەکان پاشگەزبوونەوە وتیان : نەنوێژدەکەین و نەزەکا تیش دەدەین ، ئەم ئایەتە :** {قل للمخلفين من الأعراب ستدعون الى قوم أولي بأس شد يد٠٠٠} **ئەوەبو پێشەوا ئەبوبەکرجەنگی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان کرد ، خالیدی کوڕی وەلید چوو بەرەو(الیمامە) بۆجەنگی موسەیلەمەی درۆزن گەمارۆیانی دا چەندڕۆژێك پاشان مو سەیلەمەی درۆزن کوژرا ، وەحشی کوشتی کەبکوژی حەمزەی مامی پێخەمبەربوو (درودی خوای لەسەربێ)، لەم شەڕەدا حەفتاهاوەڵ شەهیدبوون ، وەموسەیلەمە ڕۆژی کوژرانی تەمە نی (١٥٠)سەدوپەنجاساڵ دەبوو٠وەلەساڵی دوازدەی کۆچی دا پێشەوائەبوبەکر** (علاء ابن – حضرم)**ی ناردبۆ(بەحرێن) ، کەپاشگەزبووبوونەوە موسوڵمانەکان سەرکەوتن٠وە (عیکرە مەی کوڕی ئەبوجەهل)ی ناردبۆ(عمان) کەپاشگەزبووبوونەوە ، کەتەنها ئەبولعاص کوڕی ڕ ەبیعی هاوسەری زەینەبی کچی پێخەمبەر(درودی خوای لێ بێ) و** صقب ابن جثافه ليثي و أبومرثدالغثون **شەهیدبوون٠وەعومەری کوڕی خەتابی ناردبۆشام لەساڵی سیانزەم دا تیایدا موسوڵمانەکان سەرکەوتن وعکرمە کوڕی ئەبوجەهل وهیشام کوڕی عاس لەگەڵ کۆمەڵێکی**

ترشەهیدبوون٠

خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێ) : عومەری کوڕی خەتاب لەنەزا نی دا باڵیۆزی قورەیش بوو کاتێ قورەیش جەنگێکیان هەبوایە بەسەفیردەیان نارد٠پێشەوا عومەر(خوای لێ ڕازی بێ) (٥٣٩) پێنجصەدوسی ونۆفەرموودەی لەپێخەمبەروە (درودی خوا ی لەسەربێ) گێڕاوەتەوە٠

یەکەم کەس بووە ، کەپێی وتراوە : (أمیر المؤمنین)واتا (ئەمیری باوەڕداران) ، یەکەم کەس بووە کەنوێژی تەراویحی ڕێکخست ، یەکەم کەس بووە کەمێژووی کۆچی دانا ، یەکەم کەس بووە کەدیوانی دانا ، یەکەم کەس بووە کەلەسەرئارەق هەشتا جەلدەی لێدا٠

لەڕۆژگاری خەلافەتی عومەردا (خوای لێ ڕازی بێ) ، ئەم ناودارانە وەفاتیان کرد : (ئەبوقحا فەی باوکی پێشەوا ئەبوبەکر(خوای لێ ڕازی بێ) ، ئەبوعوبێدەی جەراح ، معازی کوڕی جە بەل ، یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان ، بیلالی حەبەشی ، خالیدی کوڕی وەلید ، وەچەندهاوەڵی تر(خوایان لێ ڕازی بێ)٠

خەلیفەی سێیەم : عوسمانی کوڕی عەفان (خوالێی ڕازی بێ) :

عوسمانی کوڕی عەفان کوڕی عاس کوڕی ئومەییە کوڕی عبدشمس کوڕی عبدمناف کوڕی - قوسەی کوڕی کلاب کوڕی لوئەی کوڕی غالب قورەیش٠روقیەی کچی پێخەمبەر(درودی خوا ی لەسەربێ) خێزانی بوو ، دوای مردنی روقیە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) کچێکی تری دایێ ، کەناوی ئوم کەلسوم بوو ئەویش وەفاتی کرد لەساڵی (٩)نۆی کۆچی دا٠بۆیەپێی دەڵێن : (ذوالنورین) واتا خاوەنی دوونورەکە ، چونکە دووکچی پەیامبەری خواستووە٠

خەلیفەی چوارەم : عەلی کوڕی ئەبوتالیب (خوالێی ڕازی بێ) :

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئامۆزای پێخەمبەرە (درودی خوای لەسەربێ) ، هەروەها فاتیمەی کچی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) خێزانی بووە٠

ئەوناودارانەی لەسەردەمی خەلافەتی ئەودا کۆچی دواییان کرد لەوانە : (حوزەیفەی کوڕی یەمان ، زوبێری کوڕی عەوام ، تەلحە ، سەلمانی فارسی ، ئووەیسی کوڕی قەرەن ، عەمارکوڕ ی یاسر ، سوهێبی ڕۆمی ، محەممەدی کوڕی ئەبی بەکری صدیق و کەسانی دیکە)٠

وانەی دوازدەیەم- دەوڵەتی ئومەوی :

معاویەی کوڕی ئەبوسفیان کوڕی سەخر کوڕی حرب کوڕی ئومەییە کوڕی عبدشمس دامەز ڕێنەری دەوڵەتی ئومەوییە٠ڕۆژی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بووە ، (١٦٣)سەدوشەست و سێ فەرموودەی گێڕاوەتەوە٠ئەلشەعبی دەڵێ : یەکەم کەس بووە کەبەدانیشتنەوە وتاری دا ، یەکەم کەس بووەپۆستەی دانالەئیسلام دا٠لەسەردەمی معاویە ئەم ناودارانەکۆچی دواییان کرد : (عائیشەی دایکی باوەڕداران (خوالێی ڕازی بێ) ، لبیدی شاعیر ، عەمری کوڕی عاس ، ئەبوموسای ئەشعەری ، زەیدی کوڕی سابت ، ئەبوبەکرە (نەك ئیمامی ئەبوبەکر) ، موغیرە ی کوڕی شوعبە ، ئەبوئەیوبی ئەنصاری ، ئەبوقتادەی ئەنصاری ، عبدالرحمن ی کوڕی — پێشەوا ئەبوبەکر ، حەسانی کوڕی سابت ، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و کەسانی دیکە)٠

یەزیدی کوڕی معاویە

عبدالملك ی کوڕی مەڕوان ی کوڕی حەکەم ی کوڕی ئەبی عاص ی کوڕی ئومەییەی کوڕی عبدشمس ی کوڕی عبدمناف ی کوڕی قوصەی کوڕی کلاب لەساڵی (٢٦)ی کۆچی لەدایکبو وە ، یەکەم کەس بووە کەلەسەرڕووی پارەی نووسی : (قل هواللەاحد)٠ئەوناودارانەی کە لەسەردەمی ئەودا کۆچی دواییان کرد : (ئیبن عومەر ، ئەسمای کچی ئیمامی ئەبوبەکر ، ئەبوسەعیدی خودری ، جابری کوڕی عبداللە ، عبداللەی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبی تا لیب ، شریحی قازی ، ئەبان کوڕی عوسمان کوڕی عەفان ، ئەبوعبیدە کوڕی عبداللە کوڕی مەسعود وکەسانی دیکە)٠

وەلیدی کوڕی عبدالملك

سلێمان ی کوڕی عبدالملك : عومەری کوڕی عبدالعزیزوەزیری بووە٠

عومەری کوڕی عبدالعزیز : سوفیانی سەوری دەڵێ : خەلیفەی پێنجن : (ئەبوبەکروعومەر و عوسمان و عەلی و عومەری کوڕی عبدالعزیز "خوایان لێ ڕازی بێ")٠

یەزیدی کوڕی عبدالملك ی کوڕی مەڕوان ی کوڕی حەکەم

هشام کوڕی عبدالملك ی کوڕی مەڕوان : لەسەردەمی ئەودا ئەوناودارانە کۆچی دواییان کرد : (سالم ی کوڕی عبداللە کوڕی عومەر ، تاوس ، قاسم ی کوڕی محەممەد کوڕی ئەبوبەکر ، حەسەن ی بەصری ، محەممەدی کوڕی سیرین ، جریر ، وەهب کوڕی منبە ، مالك ی کوڕی

**دینار ، کوڕی شەهاب الزهری و کەسانی دیکە)٠**
**وەلید کوڕی یەزید کوڕی عبدالملك ی کوڕی مەڕوان ی کوڕی حەکەم، سیوطی دەڵێ : وەلید خەلیفەیەکی خراپ بووە ، بخۆرەوەی ئارەق بوو٠زەهەبی دەڵێ : وەلیدلەدین دەرچوونەبوو ، بەلاّم ناوبانگی بەعەرەقخۆری دەرکردبوو ، خەڵك لێی ڕاپەڕین٠**
**یەزیدی کوڕی وەلید**
**ئیبراهیم کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك**
**مەڕوان حمار : کۆتاپاشای بەنی ئومەییەیە ، زۆرئارام گربووەلەسەرنارەحەتییەکانی جەنگ بۆیە ناویان ناوە (حمار) لەجزیرە لەدایکبووە٠**

وانەی سێزدەیەم - دەوڵەتی عەبباسی :
یەکەم خەلیفەی عەبباسی ناوی (ئەبوعەبباسی (سفاح)ی کوڕی عبدالله کوڕی محمد کوڕی عەلی کوڕی عبدالله کوڕی عەبباس کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم)ە ، لەسالی (١٠٨ك)لە دایکبووە٠
المنصور : لەساڵی (١٣٧ك) دەسەلأتی گرتەدەست و یەکەم ئیشی کوشتنی ئەبوموسلیم خوڕا سانی بوو ، ساڵی (١٤٠ك) دەستی کردبەدروستکردنی شاری بەغدا٠لەسەردەمی دەسەلأتی مە نصوڕدا ئەم ناودارانە کۆچی دواییان کرد : (ئیبن مقفع ، کلبی ، الاوزاعی وکەسانی دیکە)٠
مەهدی : لەسەردەمی دەسەلأتی مەهدی دا ئەم ناودارانە کۆچی دواییان کرد : (سوفیانی — سەوری ، ئیبراهیم کوڕی ئەدهەمی زاهید ، خەلیل کوڕی ئەحمەد و کەسانی دیکە)٠
هادی : ناوی (موساکوڕی مەهدی کوڕی مەنصوڕ)ە ، زەهەبی دەڵێ : سەرخۆشکەرەکانی دە خواردەوە لەگەڵ ئەوانەش دا زمان پاراوبووە ، دەسەلأتەکەی تەنها ساڵێك و چەندمانگێك بووە ، ساڵی (١٧٠ك)وەفاتی کرد٠
هاروون : (کوڕی مەهدی کوڕی محمد کوڕی مەنصوڕ)ە لەتەمەنی (٤٥) ساڵی دا کۆچی دوایی کردووە لەساڵی (١٩٣ك)٠لەسەردەمی هاروون ڕەشید چەندناودارێك کۆچی دواییان کرد : (ما لیك کوڕی ئەنەس ، سیبویە ، عبداللەی کوڕی موبارەك و کەسانی دیکە)٠
ئەمین
مەئموون : ئەوناودارانەی لەسەردەمی ئەودا کۆچی دواییان کرد : (ئیمامی شافیعی ، قورتو بی و کەسانی دیکە)٠
المعتصم بالله
الواثق بالله
المتوكل على الله
ئەوناودارانەی لەسەردەمی متوکل دا کوژراون یان شەهیدکراون : (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و کەسانی دیکە)٠
منتصربالله
المستعين بالله
المعتزبالله

**المهتدى بالله**

**المعتمدعلى الله : لەسەردەمی ئەودا قەرامیتە دەرکەوتن ، کەجۆرێك بوولەدین هەڵگەڕانەوە ، کەبانگەوازیان بۆچەندین شت دەکرد لەوانە : دەیان ووت : عارەق حەلالە، خۆشۆردن پێو یست نییە دوای تێکەڵبوون وچەندین شتی تر٠ئەوناودارانەی لەسەردەمی ئەودا کۆچی دوا یيان کرد : (بوخاری ، موسلیم ، ئەبوداود ، تیرمزی ، ابن ماجە ، زەهەبی وکەسانی دیکە)٠**

المعتضدبالله

المكتفي بالله

المقتدربالله **: ئەوناودارانەی لەسەردەمی ئەودا وەفاتیان کردووە : (النسائی خاوەنی السنن و کەسانی دیکە)٠**

قاهربالله

رازي بالله

المتقي بالله

المستكفي بالله

المطيع بالله **: ئەوناودارانەی لەسەردەمی ئەودا کۆچی دواییان کردووە : (ئەبونەصری فارا بی و الدینوری و ئەبوعەلی تەبەری و ئبین حەبانی خاوەنی ئەلصەحیح و ئەبولفەرەج خا وەنی ئەغانی و کەسانی دیکە)٠**

الطالع **لله**

**القادربالله**

القائم بأمر الله **: ئەوناودارانەی لەسەردەمی ئەودا کۆچی دواییان کردووە : (خەتیبی بەغداد ی وکەسانی دیکە)٠**

المقتدى بأمر الله

المستظهربالله

المسترشدبالله **: ئەوناودارانەی لەسەردەمی ئەودا کۆچی دواییان کرد : (ابن عقیل حنبلی و فارقی و ئەبونەصرقشیری و کەسانی دیکە)٠**

**الراشدبالله**

**المقتفى** للأمر الله

المستجدبالله **: ئەوناودارانەی لەسەردەمی ئەودا کۆچی دواییان کردووە : (الدیلمی خاوەنی**

**مسندالفردوس و کەسانی دیکە)٠**

المستمر بأمر الله

ناصر الدين الله **: خەلافەتەکەی ماوەی (٤٧)ساڵ بەردەوام بوو ، زەهەبی دەڵێ : کەس لەخە لیفەکان ئەوەندەی ئەم خەلیفایەتیان نەکردووە ، ناوی خۆی ئەحمەدە ودایکی تورکە ناوی (زمرد)بووە ، ساڵی (٦٢٢ك) وەفاتی کردووە٠لەساڵی (٥٨٣ك) سوڵتان صلاح الدين زۆرێك لە وڵاتانی شامی گرتەوە کەبەدەست فرەنجەکانەوەبوو گرینگترینیان (بيت المقدس) بوو ، لەسا ڵی (٥٨٩ك) سوڵتان صلاح الدين وەفاتی کرد ، کەتەنیا دینارێك و سی و شەش درهەمی بە جێهێشتووە٠**

الظاهر بأمر الله

المستنصر بالله

المستعصم بالله٠

وانەی چواردەیەم - لەخزمەت سورەتی لوقمان :

بسم الله الرحمن الرحيم

{يابنى أقم الصلوة وأمربالمعروف وانه عن المنكر واصبر على مأأصابك ان ذلك من عزم الأمور ولاتصعرخدك للناس ولاتمش في الأرض مرحا ان الله لايحب كل مختا ل فخور واقصد في مشيك واغضض من صوتك ان أنكرالأصوات لصوت الحمير}
لقمان : ١٧ ــ ١٩

مەبەستەکەی :

١ – لەسەرباوکان پێویستە فەرمان بەمنداڵەکانیان بکەن کەوا نوێژبکەن٠دەبێ خۆیان لەبەر دەمی منداڵەکانیان نوێژبکەن ، تائەوانیش فێری نوێژببن و چاو لەباوکیان بکەن ، چونکە منداڵ چاولەکردەوەی باوك و دایکی دەکات٠

٢ – ڕێپیشاندانی خەڵك بۆکردەوەی چاکەودوورکەوتنەوە لەخراپە٠

٣ – خۆڕاگرتن لەسەرهەمووەردومەینەتییەك٠

٤ – ئادەمیزادخۆی لەخەڵك بەگەورەترنەزانێت و فیزیان بەسەردا نەکات و بەفیزودەعییە بەناویان دا نەڕوات پێویستە لەسەری بەئارامی بڕوات و پەلەنەکات و زۆرخاووخلیچکیش نەبێت٠

٥ – پێویستە لەسەرئادەمیزاد کەقسەی لەگەڵ هاوڕێیەکی کرد بەدەنگێکی نرم قسەبکات ، چونکە نیشانەی ئەدەب و ڕەوشت جوانییە٠

**وانەی پازدەیەم - زەکاتدان :**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

{والذين يكنزون الذهب والفضة ولاينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب اليم} التوبة : ٣٤

**مەبەستەکەی :**

**١ – خوای گەورەپێویستی کردووە لەسەرهەمووموسوڵمانێك کەبالغ بووبێت وشێت نەبێت وخاوەن سامان و دارایی بێ ، هەمووساڵێك هەندێك لەوسامان و داراییەی جیابکاتەوەوبیدات بەهەژاران بۆئەوەی ئەوانیش گوزەرانیان خۆش بێت و دەردی هەژارییان لێ لابدات٠**

**٢ – ئەودەوڵەمەندانەی کەڕژدی دەکەن و زەکات نادەن لەدنیاداموحاسەبەدەکرێن ولەدوارۆژیش دا پارەوسامانەکەیان لەناوئاگرسووردەکەنەوەولەشیان بەوپارەسوورکراوانەداغ دەکەن٠**

**وانەی شازدەیەم - حەج کردن :**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

{وأذن في الناس بالحج يأتوك رجالا وعلى كل ضامر يأتين من كل فج عميق} الحج : ٢٧

**لێکدانەوەی وشەکان :**

وأذن في الناس بالحج : **خەڵك بانگ بکەن بۆسەردانی ماڵی خودا و پێیان بڵێن بچن حەج بکەن٠**

**رجالا : بەپیادە**

وعلى كل ضامر : **بەسواری ئەسپ و حوشتری لەڕوالاوازەوە**

**فج : ڕێگایەك بەناودەربەندێکی نێوان دووچیادا بڕوات بەمەرجێك ڕێگاکەتەسك نەبێت**

**عميق : دوور**

**حەج بریتییە لەزیارەتکردنی ماڵی خوا(جل جلالە)٠حەج چەندین سوودی هەیە لەوانە : یەکترناسین لەگەڵ حاجیانی ولأتانی ترو٠٠٠هتد٠**

**چەندخاڵێك :**

**١ – حەجکردنەکە لەبەرخاتری خوای گەورەبێ و بۆئەوەنەبێ بڵێن فلأنەکەس حەجی کر دووە٠**

**٢ – بەماڵێکی حەلالەوەبڕوات٠**

**٣ – خۆی بپارێزێ لەغەیبەت ودرۆ٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** (( العمرة الى العمرة كفارة لما بينهما ، والحج المبرورليس له جزاء الاالجنة)) رواه – البخاري ومسلم ومالك والنسائي وابن ماجة٠

**واتا : ((عومرەتاعومرە کەفارەتەبۆگوناه ، حەجی پاکیش پاداشتی بەهەشتە))٠**

**بەدەل حەج :**

**١ – دروست نییە کەسی لەشساغ وەکیل بگرێت بۆحەج٠**

**٢ – دروستەحەجی فەڕز بکرێت بۆمردوو یان پەککەوتە بەمەرجێك پەککەوتنەکەی بە جۆرێك بێت بەتەمای چاکبوونەوە نەبێت٠لای حەنەفییەکان دەبێ بریکارەکە لەشوێنی – نیشتەجێبوونی مردوو یان پەککەوتە بچێت بۆحەج ، لای حەنبەلییەکا**

نیش دروست نییه لەمەککە کەسێکی بۆبگیرێت مەگەرپارەکەی کەم بێت و بەشی نەکات لە ولآتی خۆیەوە بۆی بگرن لەوحالەتەدا دروستە٠بەلاّم لای شافیعییەکان دروستە کەسێکی مە ککە حەج بۆکەسێکی دەرەوەی مەککە بکات٠هەروەهالای شافیعییەکان و زۆربەی زانایان هە رکەس خۆی حەجی فەرزی لەسەربوو ناتوانێ حەج بۆکەس بکات٠

ماچکردنی دەست :

ماچکردنی دەست نەریتێکی باوی ناوکۆمەلگای کوردەواری یە وەك : ماچکردنی دەست لە کاتی هاتنەوەی لەحەج و ماچکردنی دەستی خەزوورلەکاتی ژن مارەبڕین و ٠٠٠هتد٠هەیا نەلەزانایان دەڵێن دروستە ماچکردنی دەستی دایك و باوك و کەسانی خواناس و بەتەمەن٠ بەلگەیان ئەوەیە هەرکاتێ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بچووبایە لای فاتیمە یەکسەر هەڵدەستاودەستی باوکی ماچ دەکرد ولەشوێنی خۆی دای دەنا٠هەشیانە دەڵێن دروست نییە بەلگەیان بەلگەی عەقلی یە دەڵێن دەبێتە هۆی خۆبەگەورەزانین و لەخۆبایی بوون یاخود دەڵێن لەڕووی تەندروستی یەوە ڕەنگە باش نەبێ٠جاری واشە بەوشە بۆڕێزگرتن و خۆشەو یستی دەڵێن دەستت ماچ دەکەم٠

**وانەی حەڤدەیەم - ڕێزلێ گرتنی دایك و باوك :**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

{وقضى ربك الاتعبدوا الاایاه وبالوالدين احسانا اما يبلغن عندك الكبرأحدهما أوكلا هما فلاتقل لهما أف ولاتنهرهما وقل لهما قولاكريما واخفض لهما جناح الذل من الر حمة وقل رب ارحمهما كما ربيانى صغيرا}الأسراء : ٢٣ – ٢٤

**مەبەستەکەی :**

**خوای گەورە فەرمانی پێکردووین تەنیا ئەو بپەرستین پاشان پێویستی کردووە لەسەرمان کەوا لەگەڵ دایك و باوکمان چاك بین ، چونکە دایك و باوك منداڵ بەخێودەکەن و شەو نخوونی بەدیارییەوە دەکێشن ، ئەگەرتووشی نەخۆشییەك بوو نارەحەت دەبن ، ئەگەرلە شساغ بوو شادومان دەبن و هەرچییەك هەبێ بۆبەرژەوەندی منداڵەکانیان بەختی دەکەن. ئەگەرمنداڵ دایکی مرد ئەوا دەکەوێتە بەردەستی زڕدایکی ، کە بێگومان زڕدایکیش زۆربە یان سۆزیان بۆمنداڵی مێردەکەیان نییە و نازیان ناکێشن و هەندێ جاریش لێیان دەدەن و بەرەڤی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن وبەڕووگرژی تەماشایان دەکەن.وەئەگەرمنداڵ سەد مام و خاڵی هەبێ وەسەد پلکی هەبێ ناگاتە سۆزی دایك و باوکی.خوای گەورە بەهۆی دایك و با وکەوە ئێمەی دروست کردووە کەدەبێت مرۆڤ فەزلی ژنەکەی نەدات بەسەردایکی دا.ئەگەر هاتوو کەسێك ڕۆژێك چاکەی بەرامبەرت کرد نابێ لەیادی بکەی ، چاکەی دایك و باوکیش لەژمارە نایەت.ئەوکاتەی خۆت دەبی بەدایك یان باوك دەزانی دایك و باوك چەند گەورەن.**

**وانەی هەژدەبەم - ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان :**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

{ياأيهاالذين امنوا كتب عليكم الصيام كماكتب على الذين من قبلكم لعلكم تتقون} البقرة : ١٨٣

**خودای گەورە لەسەری پێویست کردووین ، کەلەڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبین و نە خۆین و نەخۆینەوە ئەوەی لەسەرئەوکەسانە پێویست کردووە کەلەشیان ساغە و لەشوێنی خۆیان نیشتەجێن٠بەلاّم ئەوەی نەخۆش بێ ڕۆژوو زیانی پێ بگەیەنێ دەتوانێت ڕۆژوو نە گرێت ، ئەوەی ڕێبواریش بێت ئەویش دەتوانێت ڕۆژووبشکێنێت ، چونکە سەفەرمرۆڤ ماند ودەکات٠ئەونەخۆشەی بەڕۆژوونابێت دەبێت پاش چاکبوونەوە ڕۆژووەکان بگرێتەوە ، هەر وەها ڕێبواریش کەنیشتەجێ بوو لەشوێنێك دا دەبێ ڕۆژووی ئەوڕۆژانە بگرێتەوە کەڕۆژوو ی تێدانەگرتووە٠**

**پیرەمێردوپیرەژن ومرۆڤی بێ هێزوبێ توانا ئەگەرنەتوانن بەڕۆژووبن پێویستەلەجیاتی ڕۆ ژووشکاندنی هەرڕۆژێك سەدەقەیەك بکەن و بیدەن بەهەژارێك ئەوسەدەقەیەش بریتییە لەخۆراکی ڕۆژێکی تەواو ، وەئەگەرزیاتری بداتێ چاکترەبۆی٠**

**خودا (جل جلاله) بۆیەڕۆژووی لەسەرپێویست کردووین تالەشمان ساغ بێ و خۆڕاگربین و ئازاری برسییەتی بزانین و شارەزای حالی هەژاران بین و یارمەتییان بدەین٠**

**وانەی نۆزدەیەم - کارکردن و هەوڵدان :**

**پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((**التمسوا الرزق في خبايا الأرض**))**

**واتا : ((بەدوای ڕزقی خۆتان دا بگەڕێن لەوگەنجینانەدا ، کەلەژێرزەوی دا شاردراونەتەوە))**
**وەکونەوت کەخەڵك بیری قوولی بۆلێ دەدەن تادەری بهێنن٠ئادەمیزادکاربکات ڕزقی دەست**
**گیردەبێ و ژیانی خۆش دەبێ٠کارکردن سامانی نەتەوەش زیاددەکات ، چونکە کرێکاردەتوا**
**نێت کەل و پەلی زۆربەرهەم بێنێت و بینێرێتە دەرەوە بۆفرۆشتن و بەپارەکەی کەل وپە**
**لی تربکرێت کەلەوڵاتەکەی خۆی نەبێت٠ئەونەتەوەیەی کارگەی نەبێت ڕۆڵەکانی کاریان دە**
**ست ناکەوێت بەمەش بێکاری بڵاودەبێتەوە و تەنانەت دەرزی لەدەرەوە دەکڕێت٠پێخەمبەر**
**(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : ((ئەوەی لەهەمووشت زیاترلێی دەترسم تووشی ئو**
**وممەتەکەم بێت : ورگنی و خەوالوویەتی و تەمبەڵییە))٠کەواتە دەبێت هەوڵبدەین بۆنان -**
**پەیداکردن ، چونکە پاروولەخۆیەوە ناکەوێتە ناودەممان ، گەنمیش هەتا زەوی بۆنەکێلی و**
**تۆوی بۆدانەچنی و ئاوی نەدەی پێناگات٠**

**نابێ کرێکارێك یان فەرمانبەرێك، کەخاوەن کارەکەی یان بەڕێوەبەرەکەی دیانەما سستی لە**
**کارەکەی بکات ، بەڵکوهەمووکاتێك دەبێ کارەکەی بەباشی بەڕێوەببات جاخاوەن کارەکەی د**
**یاربێت یان نا٠**

**کابرایەك هەبوو پیشەی پاککەرەوەی شەقامەکان و ڕشتنی زبڵی ماڵان بوو ، ڕۆژێکیان کوڕ**
**ەکەی لەمەکتەب هاتەوە وتی : باوکە گیان خۆزگە پیشەکەت پاککەرەوە نەبوایە ، ووتی :**
**بۆچی ؟ ووتی : لەوکاتەی مامۆستا لەقوتابییەکان دەپرسێت : تۆباوکت ئیشی چییە ؟ یە**
**کێ دەڵێ : باوکم دکتۆرە ، یەکێ دەڵێ : ئەندازیارە ، کەمن سەرەم دێ دەڵێم باوکم ئیشی**
**پاککردنەوەیە هەمووپێدەکەنن بەمامۆستاشەوە٠باوکی وتی : ڕۆڵەگیان من بۆخۆم دەژیم**
**گسکدەروکەنناس ئەوکەسەیە پیسی ڕادەماڵێ کەواتە هەمووخەڵکی گسکدەرن بۆنموونە :**
**هەمووکەسێك ڕۆژانە دەم و چاوی دەشوات ، خۆی دەشوات ، دەست و قاچی دەشوات ، ماڵە**
**کەی گسك دەدات هەریەکەیان خەریکی پاککردنەوەی پیسییەکە٠**

**وانەی بیستەم - هاوڕێیەتی پیاوچاکان :**

وشەی هاوڕێ لەدوو وشە پێکهاتووە : (هاو) لەگەڵ (ڕێ) واتا دووکەس هەمان ڕێگەدەگرنە بەربۆبەسەربردنی ژیانیان٠جاهەیانە ڕێگەی نادروست و ناڕێك دەگرنەبەر ، هەشیانەڕێگە ی ڕاست٠ لەزمانی عەرەبی دا بەرامبەر وشەی هاوڕێ چەند وشەیەك هەیە :

یەکەم - زەمیل : واتا ئەوکەسەی لەفەرمانگەیەك یان کۆمپانیایەك بەیەکەوە کاردەکەن یان لەقوتابخانەیەك یان هاوپۆلن هەڵبژاردنی تێدانییە ، بەناچاری بوونەتە هاوڕێ٠

دووەم — صدیق : واتا ئەوکەسەی بەحەزوخولیای خۆت بۆتە هاوڕێت هەرچەندە لەیەکترد ووربن پەیوەندی لەنێوانتان دەمینێ٠

ئادەمیزاد ناتوانێت بەتەنیا بژیت ولەخەڵکی تردووربێت وپەیوەندی پێیانەوە نەبێت بۆیە ناچارە لەگەڵ خەڵك تێکەڵ بێ و هەڵسێ و دانیشێ لەگەڵیان٠لێرەدا تووشی کە سی چاك و خراپ دەبێ ئادەمیزادی ژیرئەوکەسەیە هاوڕێیەتی پیاوچاکان بکات و خۆی لەپیاوی خراپ بەدووربگرێت ، چونکە لەپیاوچاکان کەڵك وەردەگرێت و لەپیاوخراپان زیانی تووش دەبێ٠ هاوڕێیەتی پیاوخراپان ئادەمیزاد تووشی پیاوخراپی دەکات ئەویش فێری کردەوەکانی ئەوا ن دەبێت وەك چۆن گڕو ساغ گڕوودەکات٠چەندکەس لەئێمە بیستوویەتی کەبرادەرەگیانی بەگیانییەکەی خۆی بۆپارە یان بۆمۆبایلەکی گرانبەها یان بۆسەیارە یان بۆقەرز برادەرەکە ی خۆی کوشتووە دەرچووە کەبرادەرەکەی خۆی کوشتوویەتی٠

هیچ گومانی تێدانییە ئەگەرهاوڕێی کەسی خراپ بیت ئەوە ڕات دەکێشێ یۆئەوشتەی خۆی لەسەرە ، ئەگەرزیناکاربێت فێری زینات دەکات ، ئەگەردزبێت فێری دزیت دەکات وەکووترا وە : (الصاحب ساحب) واتا : (هاوڕێ ڕاکێشەرە) بۆئەوشتەڕات دەکێشێ کەخۆی دەیکات ، ئە گەرچاك بووفێری چاکەت دەکات وەئەگەرخراپ بوو فێری خراپەت دەکات٠پێخەمبەر(درود ی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((٠٠٠ولایأکل طعامك الاتقي))٠ مەبەست ئەوەیە کە سێ موتتەقی نەبێ نەیبەیەوە ماڵەوە بۆئەوەی دڵنیابی ، کەبەچاوی خیانەت سەیری عا — ئیلەت ناکات٠ئەمرۆواباوە کەئافرەت خزمەتی میوان بکات وچای وقاوە بباتە بەردەم میوان ئەگەرمیوانەکە خزم بێ قەیناکە٠ئەم ئایەتە : {یعلم خائنة الأعین وماتخفي الصدور} غافر : ١٩

واتا: (خوا(جل جلاله)ئەزانێ بەچاوە خیانەتکارەکان و بەوەی لەناودڵیان دایە)٠وتراوە ئەو

چاوانه بریتین لەوچاوانەی ، کەبەدزی و نهێنی یەوە تەماشای نامووسی خەڵکی دەکەن٠
(خائنة الأعين) بەوەدەڵێن : کەیەکێ بچێ بۆماڵێك بەچاوی خیانەت تەماشای ئافرەتی ئە وماڵەبکات ، کەکاتێك چاویان لێی بوو تەماشاناکات ، بەڵام کاتێ چاویان لێی نەبوو تەماشای ئافرەتەکە دەکات٠

هاوڕێ هۆکارێکە بۆهەمووجۆرە گۆڕانکارییەك چەندەها گەنج بەهۆی هاوڕێی خراپەوە تیا چوون بۆیە هاوڕێیەتی ئینسانی خراپ مەکە٠ئەم ئایەتە : { یوم یعض الظالم علی یدیه یقول یلیتنی اتخذت مع الرسول سبیلا یویلتی لیتنی لم اتخذ فلانا خلیلا لقد أضلنی عن الذکربعد اذ جاءنی وکان الشیطن للأنسن خذولا } الفرقان : ٢٧ ــ ٢٨ ــ ٢٩
واتا : (لەڕۆژی دوایی دا ستەمکاردەستی خۆی دەگەزێ و دەڵێ : خۆزگە لەگەڵ پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بوومایە و هاوڕێیەتیم لەگەڵ ئەوبکردبایە پاشان دەڵێ : ماڵ و یران خۆم خۆزگە فلآنە کەسم نەکردبا هاوڕێی خۆم ، چونکە بەڕاستی لەڕێگەی باوەڕ ــ هێنان گومڕاوسەرلێشێواوی کردم ، کەئەوڕێبازەم گرتبوو بەڕاستی شەیتان بۆمرۆڤ ڕیسوا کەروسەرشۆڕکەرە)٠

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی (عوقبەی کوڕی ئەبی معیط) دابەزیوە کاتێك کەهاوڕێیەکی کافری هەبوو (ئەبوجەهل) بووبەهۆی بەدبەختی هەتاهەتایە ، ئەم هاوڕێیەی عوقبە کە زانی عوقبە موسوڵمان بووە خۆی لەعوقبە حاجز کرد وتی: تاپەشیمان نەبیتەوە لەئیسلام قسەت لەگەڵ ناکەم ، عوقبەش وتی : باشە لەئیسلام پاشگەزدەبمەوە ، بەبێ شەرمییەوە ــ چوو جنێوی بەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)داو لەئیسلام پاشگەزبۆوە ، خۆی بەدبە خت و چارە ڕەشی دنیاوقیامەت کرد ئەوەش بەهۆی هاوڕێی خراپەوە٠

وانەی بیست و یەکەم - بەزەیی هاتنەوە بەگیانداران :

گیاندار ناتوانێت ئەگەرئازارێکی هەبوو سکالأی دەردی خۆی بکات ، چونکە ئێمە زمانی گیا نلەبەران نازانین ، بەلأم ئادەمیزاد باسی دەردوئازارەکەی بۆکەس و کاری خۆی دەکات یان د ەچێت بۆلای دکتۆر ئەویش تیماری دەکات و دەرمانی دەداتێ و دەردەکەی سووك دەکات یان لای دەبات٠ئادەمیزاد ئەگەرتینووبێت داوای ئاودەکات وەئەگەربرسی بوو داوای خواردن دەکا ت٠خوای گەورە گیاندارانی بۆئەوە دروست کردووە کۆڵ و بارمان بۆهەلگرن و شیرەکەیان — بخۆین و ڕۆنیان لێ بگرین و گۆشتیان بخۆین وخورییەکەی جل و بەرگی لێ دروست بکەین٠ ئادەمیزاد منداڵێکی لێ ون دەبێت شوێن نامینێ سەری پیانەکات بەدوای ئەومنداڵەدەگەڕێ بۆدۆزینەوەی هەواڵ بەهەمووپۆلیسخانەکان دەدات و لەڕۆژنامەکان دا یان لەڕادیۆ جاڕی و نبوونی ئەومنداڵەدەدات تامنداڵەکەی دەدۆزێتەوە گریان لەماڵی نابڕێت ، بەلأم گیاندار — بێچووەکەی وون دەبێت ناتوانێت وەك ئێمە بکات ، چونکە پێی ناکرێت٠

گیاندار دووجۆرە :

یەکەم گیاندارە زیانبەخشەکان ئادەمیزاد دەخوات یان پێوەی دەدات وەك : گورگ و مارو دو پشك و ٠٠٠هتد ، ئەمانە دەبێ خۆمانیان لێ بپارێزین٠ دووەم گیانداری ماڵی و سوودبەخش پێویستە بەزەییمان پێیان دا بێتەوە٠

باڵندەکان گرینگی دەدەن بەفێرکردنی بێچووەکانیان بۆنموونە مراوی بێچووەکەی پاڵ پێوە دەنێت بۆناوئاو بۆئەوەی فێری مەلەببێت٠هەندێ جۆری هەلۆبێچووەکەی لەهێلانەکەیەوە فڕێدەداتەخوارەوە بۆئەوەی بەناچاری هەوڵی فڕین بدات٠هەرکاتێك ترسی ئەوەی بوو کە بێچووەکەی بەردەبێتەوە ئەواخۆی دەچێتەژێری وەکوئێمەکۆرپەلەکانی خۆمان فێردەکەین وڕاهێنانیان پێدەکەین٠

**وانەی بیست و دووەم - ڕاستگۆیی و درۆکردن :**

**بۆیەکەمین جاردرۆلەگەڵ باوکەئادەم کرا لەلایەن شەیتانەوە ، کەبووەهۆی دەرکردنی لە بەهەشت٠** {مانهاكما ربكما عن تلكما الشجرة الا أن تكون ملكين أوتكونا من الخالد ين} الأعراف : ٢٢

**واتا : (پەروەردگارتان بۆیە ئەودرەختەی لێ قەدەغەکردوون بۆئەوەی نەبنە فریشتە یان بۆئەوەی نەمربن)٠**

**ڕاستگۆیی بریتییە لەڕاست و دروست گێڕانەوەی هەواڵ و نەشێواندنی ڕووی ڕاستەقینەی شتەکان٠درۆکردنیش زۆرجۆری هەیە وەکودرۆکردن بەکردەوە بۆنموونە کەسێك لەڕووی جەستەوەساغ و سەلامەتە خوی دەکات بەنەقوستان یان کەم ئەندام تاکولەم ڕێگەیەوە پا رەکۆبکاتەوە سۆزی خەڵك بەلای خۆیداڕابکێشێ زۆرجارخۆی دەکات بەکەمئەندام گۆچان بەدەستەوەدەگرێت یان ڕاپۆرتێکی پزیشکی ساختەلەپێش خۆی دادەنێت ، ئەمە درۆیەکی کردەییە بەزمان نییە٠**

**شتێکی ئاساییە فرۆشیار بانگەشە بۆکالاًکانی بکات تارەواجیان پێبدات و کڕیاربۆشتەکانی زیادبکات و سەرنجی کڕیاربۆلای خۆی ڕابکێشێ لەڕێگەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆو ڕۆژنامە و گۆڤار ، بەلاًم پێویستە شتەکان وەك خۆی باس بکرێت٠ یاخودکاتێك ئۆتۆمبێلێك دەفرۆ شیت دەبێ کەم وکوڕییەکانی بەکڕیاربلێیت یان گۆشتی هیندیت بەخۆماڵی بداتێ٠یان کە ل وپەلی گران دەکڕی گوایە مارکەیەوئەسڵییە کەچی هیندە ناخایەنێ لەکاردەکەوێ٠هەروە ها لەکاری دەلاًلی دا پێویستە دەلاًل لایەنی باش وخراپی مولکەکە یان زەوییەکە یان خانوو بەرەکە بخاتەڕوو لایەنی یەکێك لەکڕیاریان فرۆشیارنەگرێت٠**

**هەواڵ ئەگەردرۆبێت زیان دەگەیەنێت ، قسەی درۆ وادەبێت زیانی بۆئەوکەسەش هەیە کە دەیکات و ئەوکەسەش کەگوێی لێ دەبێت٠کابراش کەدرۆدەکات خەڵك بەچاوی سووك تەما شای دەکەن و ڕقیان لێ دەبێتەوە٠ڕاستگوتن نیشانەی ئەوەیە کەبەئەدەبین ، چونکە درۆکر دن دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك بەچاوی سووك تەماشای کابرای درۆزن بکەن و گوێی بۆشل نەکەن٠**

**درۆڕەوشتێکی وەرگیراوە لەوژینگەیەی کەتێی دادەژی ، ئەوژینگەیەش بریتییە لە : خێزان ، قوتابخانە ، کۆلاًن ، دەزگاکانی ڕاگەیاندن ، بەپلەی یەکەم خێزان کاریگەری لەسەرمنداڵ**

دەبێ دایك وباوك پێویستەبەخۆیان ڕاستگۆبن ، تامنداڵەكانیان ڕاستگۆبن كاتێك زەنگی مۆ بایل لێ دەدرێت دەڵێ بڵێ باوكم مۆبایلەكەی بەجێهێشتووە یاخود كاتێك لەدەرگەی ماڵەوە دەدرێ  دەڵێ بڵێ لەماڵێ نییە یان نوستووە٠

وانەی بیست وسێیەم - ڕەوشت :

کانت دەڵێ : ((ڕەوشت بوونی نییە بەبێ حیساب کردنی دوای مردن))٠ئەدیبی ناوداری فە
ڕەنسی (ڤۆڵتێر)دەڵێ : ((بۆگومانتان لەبوونی خواهەیە ؟ ئەگەرخوانەبوایە (لەخواترسان)
ژنەکەم خیانەتی لێ دەکردم و خزمەتکارەکەشم دزی لێ دەکردم))٠
(م ف) دەڵێ : ((خۆزگە حکومەت کەمۆڵەتی لێخوڕین دەداتە کەسێك سەیری خوڕەوشتی
بکات ، چونکە کچ و ژنی خەڵك دەگوازێتەوە مەلەفی هەڵبداتەوە ، کەئایا پێشتردزی کرد
ووە ؟ ئایا ئارەق خۆرە ؟ ئەگەرئەمانەی هەبوو ڕێگانەدات تەکسی باژوات٠
(ع) دەڵێ : ((زۆرکەس دەڵێن لەڕۆژئاوا ئەخلاق نەماوە ، داوێنپاکی بەشێکە لەئەخلاق نەك
هەمووی٠بوونی زەمانەی تەندروستی وکۆمەلأیەتی ئەخلاق نییە ؟ هەستکردن بەبەرپرسیا
ریەتی ئەخلاق نییە؟ بەخشینی مافی پەناهەندەیی بۆخەڵکی ستەم دیدەو دابینکردنی ژیا
ن و گوزەرانیان ئەخلاق نییە ؟

وانەی بیست و چوارەم - ڕووەکخۆری :

هەندێك ئاینی دەستکرد بەتەواوەتی گۆشتی ئاژەڵ قەدەغەدەکەن ، بەلاَم ئاینی ئیسلام بە جۆرێکەڕێگەی بەخواردنی سەوزەومیوەوگۆشتیش داوە ، چونکەگۆشت سەرچاوەیەکی سە رەکییە بۆپڕۆتین ، هەروەها خوای گەورە ئادەمیزادی بەجۆرێك دروست کردووە ، کەبتوا نێت گیاوگۆشت هەردووکیان هەرس بکات٠بەلاَم ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان بەتەنیادەتوانن گۆ شت هەرس بکەن ، هەروەها گیاخۆرەکانیش بەتەنیادەتوانن گیاهەرس بکەن٠

هەروەهائەگەرتێبینی ددانی مرۆڤ بکەین ، دووجۆرەددانی هەیە : تەخت و نووك تیژ٠بۆ یە ددانەکانی گونجاوە بۆگیاوگۆشت ، بەلاَم ئەگەرسەرنج بدەینە ددانی ئاژەڵە گیاخۆرەکان وەك مانگا و بزن و مەڕ ددانیان شێوەی تەختە ، وەئەگەرسەرنج بدەینە ددانی ئاژەڵە گۆ شتخۆرەکانی وەك : شێر و پڵینگ شێوەی ددانەکانیان نووك تیژە بەجۆرێك کەگونجاوە بۆ گۆشت خواردن٠هەروەها ئەوانەی دژی کوشتنی هەموو جۆرە زیندەوەرێکن ئەمڕۆ زانست سەلماندوویەتی ، کەڕووەك ژیانی هەیە و زیندەوەرە٠بۆیە ئەو بۆچوونەی ئەوان پەیڕەوی دەکەن جێبەجێ نابێت کەپێیان وابێت هیچ زیندەوەرێکیان نەکوشتووە٠ئەگەربڵێن ڕووە ك زیندووە ، بەلاَم هەست بەئازارناکات ئەمڕۆ زانست دەڵێت : ڕووەکیش هەست بەئازاردە کات ، بەلاَم دەنگی ئازاری ڕووەك نابیسترێت لەلایەن مرۆڤەوە هەروەك توانای گوێی مرۆڤ نییە بۆبیستنی هاواری مێروولەیەك٠دەنگی مێروولە لەو ئاستەدانییە مرۆڤ بیبیستێت ، چونکە دەنگەکەیان نزمە٠

توێژینەوەیەك لەلایەن ڕووەکزانێکەوەکراوە لەئەمریکا ، کەئامێرێکی داهێناوە دەنگی ڕووە کەکان بەرزدەکاتەوە بەجۆرێك کەمرۆڤ بتوانێت بیبیستێت ، کەهاواردەکەن بۆئاو!

هەروەها ئەگەر مرۆڤەکان گۆشت نەخۆن ، ژمارەی ئاژەڵ زۆر زیاد دەکات ، چونکە وەچە خستنەوەیان زۆرخێرایە٠ئاینی ئیسلام تەنیا خواردنی گۆشتی گیانەوەری گیاخۆری ڕێگە پێداوە وەك : مانگا و مەڕ و بزن ، بەلاَم خواردنی گۆشتی گیانەوەری وەك (شێروپڵینگ)ی قەدەغەکردووە ، چونکە ئەم گیانلەبەرانە توندوتیژودڵڕەقن ، بەلاَم مانگا و مەڕ و بزن ئە م ئاژەلاَنە دوورن لەشەڕ ، بەلاَم گیانلەبەرە کەڵبەدارەکانی وەك : گورگ و سەگ ئەمانەی قەدەغەکردووە٠هەروەها قرتێنەرەکانی وەك : (مشك و جرج)ی قەدەغەکردووە ، هەروەها

خشۆکەکانی وەك (مار)ی قەدەغەکردووە٠

وانەی بیست وپێنجەم - ئایاجنۆکە دەچێتەلەشی مرۆڤەوە ؟

وشەی (جن) لەزمانی عەرەبی دا واتا (شاراوە) ، شێتیش بۆیە پێی دەوترێ مەجنوون ، چو نکە جن کاری لێکردووە٠

بێگومان جنۆکە دەچێتە لەشی مرۆڤەوە و زیان بەکەسەکە دەگەیەنێت٠ئەبی سەعیدی خو دری دەگێڕێتەوە ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((ئەگەریەکێك لە ئێوە باوێشکی دا بادەست بخاتە سەردەمی ، چونکە شەیتان دەڕواتە ژوورەوە)) ئیمامی مو سلیم ڕیوایەتی کردووە٠فەرموودەکە دەڵێ : شەیتان دەڕواتە ژوورەوە ، بەلاّم هەمووچوونە ژوورەوەیەك ئەوە ناگەیەنێت ئەوکەسە جن زاڵ بووبێ بەسەرلەشی و جێگیربووبێ٠مەر جیش نییە هەرنەخۆشییەك جەستەیی نەبێت کاریگەری جنۆکە بێت جاری وایە ئەوکە سە موشکیلەیەکی هەیە٠هۆکاری چوونی جنۆکە بۆناولەشی مرۆڤیش زۆرن ، لەوانە : تر س ، خەم و خەفەت ، سیحر و٠٠٠هتد٠

ئەونەخۆشییانەی کەمرۆڤ تووشی دەبێت بەهۆی چوونی جنۆکە بۆناولەشی ئادەمیزاد زۆر ن ، وەك : (خەمۆکی ، خەوزڕان ، لەخۆوە تووڕەبوون ، ٠٠٠هتد)٠

خەمۆکی توندهەندێ جارهۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆجنۆکە ، هەندێ جاریش خەمۆکی خۆ ی هۆکارە بۆچوونە ناوەوەی جنۆکە ، کەکاتێك مرۆڤ خەمی زۆری خوارد لەڕووی دەروونیە وەلاوازدەبێت٠

خەمۆکی بریتی یە لەهەستکردن بەخەم بەشێوەیەکی درێژخایەن ، کەبەهۆی بارودۆخ و ڕووداوی ناخۆش دروست دەبێت وەك : لەدەستدانی کەسی نزیك و پلەوپایەی کۆمەلاّیە تی و ناخۆشییەکانی ژیان و سەرنەکەوتن لەبوارەکانی ژیان٠

نیشانەکانی خەمۆکی :-

١ – دوورەپەرێزی و حەزکردن بەتەنهایی٠

٢ – نامورتاحی٠

٣ – دابەزینی کێش٠

٤ – خاوی لەجولەدا٠

٥ – شەونخوونی٠

٦ – بێتاقەتی٠

ئاستەکانی خەمۆکی :-

١ – ئاستی سوك٠

٢ – ئاستی مامناوەند٠

٣ – ئاستی توند٠

هەندێك نیشانە بەڵگەیە لەسەرچوونە ناوەوەی جنۆکە بۆلەشی مرۆڤ وەك : قسەکردنی – جنۆکە لەگەڵ جنۆکە دەرهێنەکە لەسەرزمانی نەخۆشەکەوە٠زۆرجارنەخۆش هەبووە زما نی عەرەبی یان ئینگلیزی نەزانیوە بەعەرەبی یان ئینگلیزی قسەی کردووە٠یاخودئاشکرا کردنی شوێنی دانانی ئەوشتەی سیحرەکەی پێکراوە بۆئەوەی سیحرەکە بەتاڵ بکرێتەوە٠ بۆیە جنۆکەکە ناچاردەکەن شوێنی سیحرەکە ئاشکرابکات لەسەرزمانی نەخۆشەکەوە ، تا دەگاتە ئەوەی جنۆکەکە دێتە قسەودەڵێت : بڕۆن سیحرەکە لەفلاَن شار یان فلاَن گەڕەك ، لەفلاَنە ماڵ یان لەفلاَنە گۆڕستان لەبن فلاَن شت یاخود لەناو فلاَن شت دانراوە ، کەکا تێك دەچنە ئەوشوێنە سیحرەکەی لێیە ، بەهەڵوەشاندنەوەی سیحرەکە نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە٠بەڵگەیەکی ترلەکاتی کارکردن بۆچارەسەری نەخۆشەکە بەشێکی جەستەی نە خۆشەکە هەڵدەئاوسێت کەجنۆکەکەیە لەژێرپێستی نەخۆشەکە ، زۆرجارئەوهەڵئاوسانە لەنووکی پەنجەی پێوە یان نووکی پەنجەی دەستەوە دەچێتەدەرەوە بەچوونە دەرەوەی نە خۆشەکە دەستبەجێ نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە٠بەڵگەیەکی تر لەکاتی قورئان و دوعاخو ێندن بەسەرنەخۆش دا هەندێك لەنەخۆشەکان زۆر بەتوندی دەست دەکەن بەقیژاندن و هاوارکردن و خۆڕاوەشاندن و هەڵبەزین٠بەڵگەیەکی تر هەندێك جارلەکاتی چارەسەرکرد ن پیاوی نەخۆش بەدەنگی ئافرەت قسەدەکات و ئافرەتی نەخۆش بەدەنگی پیاوقسەدەکات ئەمەش مانای وایە جنۆکەی ئافرەت چۆتەلەشی پیاوەکەوجنۆکەی پیاوچۆتە لەشی ئافرە تەکە٠بەڵگەیەکی تر هەندێك جارهەندێك نەخۆش گوێبیستی هەندێك دەنگ و قسەدەبن کەکەسانی چواردەوریان گوێیان لەودەنگانە نابێت ، ئەودەنگانەش دەنگی جنۆکەن ، یاخو د نەخۆش هەندێك شت دەبینێت کەکەسانی چواردەوری نایبینێت کەوێنەی جنۆکەیە لە

سەرشێوەی بوونەوەری دیکەی وەك سەگ و ۰۰۰هتد۰

وانەی بیست وشەشەم - بۆچی گەنجان ئالۆودەی ماددەی هۆشبەردەبن ؟

ماددەی هۆشبەرکەسەکە لەڕووی ئابورییەوەلەناودەبات۰(ع) دەڵێت : ((من هۆکاری ئەوەدە گەڕێنمەوەبۆئەوەی گەنج بێ ئیش و کارە بۆیە دەبێت ئیشی بۆبدۆزرێتەوە بۆئەوەی خوو نەداتە ئەوماددانە ، چونکە کەسەکەلەناودەچێت))۰(ع) دەڵێت : ((هۆکاری ئەوەی گەنجان چوونە ئەوروپا ئەگەرئیشێك هەبوایە کەواتە ڕێگاچارەیان ئەوەیە ئیشی بۆبدۆزرێتەوە))۰ (ع) دەڵێ : ((دەبێ لەسنورەکان پشکنینی زۆرتربکرێ و سزابدرێن بەتایبەتی ئەوانەی دە یهێنن))۰(ع) دەڵێ : ((ئەگەرگەنج ئیشی نەبێت دابنیشێ لەماڵ فکری بۆکاری خراپ دەڕ وات ، بێکاری لەناوگەنجان هۆکارێکە بۆئەوەی ڕووبکەنە ئەوماددانە ، هەروەها توندوتۆڵ کردنی سنورەکانیش هۆکارێکە بۆنەهێشتنی ئەوماددانە))۰

**وانەی بیست وحەوتەم - دەرمانخانەی ماڵ :**

**پێویستەلەهەرماڵێك دەرمانخانەیەكی بچووك هەبێت و چەندپێداویستییەكی پزیشكی تێدا هەبێت ، كەلەكاتی بوونی هەرڕووداوێكی بەركەوتن لەماڵەوە بتوانێ بەكاری بێنێ وەكوفریا گوزاری سەرەتایی٠دەبێ دەرمانخانەكە بەدیوارهەڵبواسرێ بەشێوەیەك ، كەدووربێت لەبەر دەستی منداڵ و لەشوێنێكی ساردبێت هەتادووربێت لەتیشكی خۆر٠پێداویستییەكانی دەرما نخانەلەوانە :-**

**١ – دەرمانی كەمكردنەوەی ئازار وەكو : پاڕاسیتۆڵ و پانادۆڵ٠**

**٢ – مەرهەمی سووتان و برینی بچووك٠**

**٣ – دەستكێشی پزیشكی٠**

**٤ – پێوەری پلەی گەرمی لەش٠**

**٥ – موكێش بۆدەرهێنانی دڕك یان هەرشتێك لەناوپێست٠**

**٦ – مقەس٠**

**٧ – پلاستەری جۆراوجۆربۆبرین٠**

**٨ – لەفاف بۆبەستنەوە٠**

**٩ – بەستەری سێگۆشە بۆحالەتی شكانی دەست و سەر٠**

**١٠ – لۆكەبۆهەندێ حالەتی برین و خاوێنكردنەوە٠**

**١١ – پاككەرەوەی پزیشكی (معقم) بۆپاككردنەوەی برین٠(سەرچاوە : تەندروستی و كۆمەڵ ، ژمارە (٣٠) ، ٢٠١٢)٠**

وانەی بیست وهەشتەم - بەختەوەری :

بەختەوەری مرۆڤ لەژیان دا بریتی یە لەوەی لاشەی ساغ بێت و خەم وخەفەتی نەبێت ، بەختەوەری ئەوشتەیە هەمووکەسێك هەوڵی بۆدەدات و دەیەوێ بیگاتێ٠کەسێك دەچێتە باخچەیەك گوڵێکی جوان دەبینێت دەیەوێ لێی بکاتەوە درکێك دەچێت بەدەستی دا واتا هەتاگوڵیش بەدرك دەورەدراوە٠تەندروستی بەنرخترین جۆری بەختەوەری یە ، بەرناد شۆ دەڵێت : ((مرۆڤ لەئازاری ددانەکانی خۆی وادەزانێت هەرکەس ددانی ئازاری نەبێت بەختەوەرە))٠

دەروناسی فەرەنسی (جان دۆتۆ) حەوت کلیلی بۆبەختیاری مرۆڤ داناوە لەوانە : باوەڕێکی چەسپاو بەخوای گەورە ، قەناعەت ، ٠٠٠هتد٠

بێگومان هەندێ کات هەیە مرۆڤ تێی دا بەختەوەرە ، وەك :

١ — زاناکاتێك داهێنانێکی نوێ ئاشکرادەکات٠

٢ — قوتابی کاتێك بەئامانجی خۆی دەگات٠

٣ — نەخۆش کاتێك چاك دەبێتەوە٠

٤ — کرێکارکاتێك کارەکەی تەواودەکات٠

**وانەی بیست و نۆیەم - بالأپۆشی :**

((صنفان من أهل النار ، لم أرهما : قوم معهم سياط كأذناب البقريضربون بهاالناس ونساء كاسيات عاريات مائلات مميلات رؤسهن كأسنمة البخت المائلة ، لايدخلن – الجنة ولايجدن ريحها)) رواه مسلم٠

**واتا : ((دووپۆل لەخەڵك لەئاگرن ، نەم بينيون : يەكەميان كەسانێك قامچييان پێيە پێ لەخەڵكی دەدەن ، دووەميان ئافرەتانێك جليان لەبەردايەوڕووتيشن ، بەلەنجەولاردەڕۆن سەرنجی پياوان بۆلای خۆيان ڕادەكێشن، قژی سەريان وەك پشتی وشترەواتا كۆی دەكەنە وەوبەرزی دەكەنەوە ، ئەم جۆرە ئافرەتانە نەدەچنە بەهەشت نەبۆنی بەهەشتيش دەكە ن)) ئيمامی موسليم ڕيوايەتی كردووە٠ (تێبينی : لەسەرەتا ناچنەبەهەشت)**

**عەرەبەكان لەپێش ئيسلام دا ، بالأپۆشی لەناويان دا هەبوو كەڕەنگە پاشماوەی ئاينی حە زرەتی ئيبراهيم بێت (عليە السلام)٠**

**(تبرج) لەگوناهە گەورەكان دادەنرێ ، كەبەهۆيەوە خەڵكی تريش بێجگە لەئافرەت تووشی گوناە دەبێ٠ئەوكەسانەی لەسەربالأپۆشی بەرپرسيارن : يەكەم ئافرەتەكە خۆی ، دووەم سە رپەرشتياری باوك يان مێرد يان براگەورەی بەرپرسيارن دەبێ فەرمان بەكچ و خوشك و ژ نەكانيان بكەن كە خۆيان دابپۆشن٠وەخوداوەند زياترگرينگی بەخۆداپۆشينی ئافرەت داوە ، چونكە ئافرەت دڵڕفێنترە لەپياو٠ئەوفەرموودەيە : ((زۆربەی ئەهلی دۆزەخ ئافرەتن)) ڕە نگەلەبەر پۆشاكيان بێ٠**

**١ – سەرپۆش لەقورئان دا هاتووە ، كەخوای گەورە فەرمان دەكات هەرتەنيا سەريان پێدانە پۆشن بەڵكوسينگ وبەرۆكيشيان پێداپۆشن ، خوای گەورە دەفەرموێ :** { وليضربن بخمرهن على جيوبهن }النور : ٣١

**واتا : (بەئافرەتە بڕوادارەكان بڵێ باسەرپۆشەكانيان بدەن بەسەرسينگيان دا)٠نەك لەمليان ببەستن يان لەپشتيان شۆڕكەنەوە ، چونكە ئەمە سەرنجی پياوانی پێ ڕادەكێشرێ٠**

**سەرپۆشيش دەبێ گەورەبێ ، تاهەمووسينگ و بەرۆكی پێ دابپۆشرێ نەك گچكەبێ سينگ ومليان دياربێ ، وەتوندی ببەستن نەك بێتەخوارەوە٠**

**٢ – عەبا لەقورئان دا هاتووە ، (جلباب) ئەوپۆشاكەيە ، كەئافرەت لەسەرجل و پۆشاكييەوە خۆی پێدادەپۆشێ ، كەهەمووجەستەی دادەپۆشێ كەهەرلەتۆقی سەريەوە تاپێيەكانی ، خوا**

ی گەورە دەفەرموێ : {يدنين عليهن من جلبيهن}الأحزاب : ٥٩
واتا : (عەباكانیان بەسەرخۆیان دا بهێننەخوارەوە)٠
٣ — ئەوجل وبەرگانەی کەنووسینی ئینگلیزی لەسەرە پێویستە ئافرەت لەبەری نەکات ، تالەماناکەی دڵنیادەبێت ، کەشتەکی تێدانییە ئابڕووی لەکەداربکات، چونکەجارێك کچێکم بینی لەسەرتیشێتەکەی نوسرابوو : (ئای لایك مێن) واتا : (من حەزم لەپیاوانە!)دیارە نە ی خوێندۆتەوە٠
٤ — ئافرەت دەبێ لەژێرپۆشاك پانتۆڵ یان بێجامە لەبەربكات بۆئەوەی لەکاتی سواربوونی ئۆتۆمبێل قاچ و عەورەتی بەدەرنەکەوێ ، بەلاَم دەبێ پۆشاکەکە پانتۆڵەکە دابپۆشێ نەك هەندێ قۆپچەی پۆشاکەکەی بکاتەوە٠حاکم و بەیهەقی ڕیوایەتیان کردووە ، کەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((رحم الله المتسرولات من النساء))٠
واتا : ((خوا(جل جلالە) ڕەحم و بەزەیی بەوئافرەتانەبکات ، کەپانتۆڵ لەژێرپۆشاکیان لە بەردەکەن))٠(پانتۆڵ لەژێرپۆشاك لەبەربکرێ نەك بەتەنیا)٠
٥ — دەست و دەم و چاو واجب نییە دابپۆشرێ ، بەلاَم ئەگەربیکات بەچاکە بۆی دەنوسرێ ، وەهیچ بەڵگەیەکیش نییە واجبی بکات٠
دیارە ڕووپۆش (نیقاب) لەسەردەمی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) هەبووە ، بەلاَم درو دی خوای لەسەربێ بەواجبی دانەناوە و ئافرەتانی ناچارنەکردووە بیکەن و نکوڵیشی لێ نە کردووە٠
٦ — دەبێ سەرقۆڵی جلی ئافرەت تەسك بێ بۆئەوەی کاتێك ئافرەت دەستی بەرزدەکاتەوە ، قۆڵ و باسکی دەرنەکەوێ ، نەك وەك ئێستا بن هەنگڵیان دەردەکەوێ یاخود جلەکانیان قۆ ڵی هەرنییە٠
٧ — ئافرەت هەرکاتێ بەشەقامێکی تەڕوقوڕاوی دا ڕۆیی بادامەنی کراسەکەی هەڵنەکات ، تەڕبێت باشترە نەك عەورەتی بەدیاربکەوی٠
٨ — لەکاتی دانیشتن قاچ لەسەرقاچی دانەنێ پیاوان ببینن سەرنجیان پێ ڕادەکێشێ٠
٩ — هەندێ ئافرەت زمانیان دەردەهێنن سەرنجی پیاوانی پێ ڕادەکێشن ئەمە لەسنوری حالەت دا خەریکە دەبێتە دیاردە٠

**وانەی سییەم - سەرقالبوون بەمەسائیلی جوزئی :**

**وەك ئایالەنوێژدا دەست لەسەرسینگ بێت لەسەرناوکەوەبیت یان لەخوارووی ناوکەوە ؟ خەریکی مشت و مڕبوون لەسەرمەسەلەجوزئییەکان ، ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردووە کە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((کۆمەڵێك دوای هیدایەت گومڕاوسەر لێشێواونابن ئیللاموجادەلەیان تێکەوتووە))٠**

**وانەی سی و یەکەم - موساوفیرعەون :**

**پاشاکانی میصرِ پێیان دەوترا (فیرعەون) ، پاشایەکی زۆرزاڵم هاتە سەرتەختی میصرِ نەوە ی ئیسرِائیلی دەچەوساندەوە و ویژدانی نەبوو بەرامبەریان وای دادەنا قەومەکەی خۆی کە قیبتی بوون لەجۆرێکن و نەوەی ئیسرِائیلیش لەجۆرێکی تر ، وای دەبینی قیبتییەکان دە بێ پاشایەتی بکەن نەوەی ئیسرِائیلیش کوەیلەوخزمەتکاری ئەوان بن٠**

**کاهینێك رِۆیشتەلای فیرعەون و پێی ووت : منداڵێك لەنەوەی ئیسرِائیل لەدایك دەبێت تە ختەکەت لەسەردەستی ئەولەناودەچێت٠**

**فیرعەون فەرمانی دەرکرد ، کەلەنەوەی ئیسرِائیل هەرمنداڵێك لەدایك بوو ئەگەرکورِبوو — سەری ببرِن٠بۆیە سەربازەکانی فیرعەون بەمیصرِدا بڵاوبوونەوە دەگەرِان وشوێنەکانیان دە پشکنی ئەگەربیانزانیبایە منداڵێك لەنەوەی ئیسرِائیل لەدایکبووە دەیان گرت و وەکو بەرخ سەریان دەبرِی بەوشێوەیە لەمیصرِهەزاران منداڵی ساوایان بەبەرچاوی دایك و باوکیانەوە سەربرِی٠لەوسەردەمەدا لەیەك رِۆژدا سەدان منداڵ سەردەبرِدرا هەروەك چۆن لەجەژنی قو ربان دا سەدان مەرِوگوێرەکە سەردەبرِدرێ٠**

**حەزرەتی موسا (علیەالسلام) لەدایکبوو ، خوای گەورە خستییە دڵی دایکی کۆرپەکەی بخاتە ناوسندوقێکەوە و بیدات بەدەم ئاوی (نیل)دا٠فیرعەون لەگەڵ شاژنی میصرِدا پێکەوەسەیرا نیان دەکرد لەوکاتەدا چاویان کەوت بەصندوقێك کەشەپۆڵەکانی رِوبارەکە ئەم دیووئەودیو وی پێدەکرد کاتێ صندوقەکە نزیك بۆوە فیرعەون فەرمانی بەخزمەتکارێکی کرد بچێ — صندوقەکەی بۆبهێنێ ، خزمەتکارەکە چوو صندوقەکەی لەئاوەکە دەرهێنا ، کەصندوقەکە یان کردەوە تەماشایان کردکورِێکی ساوای تێدایەوبزەی لەسەرلێوە خەڵکەکە سەرسام بوون٠ هەندێ لەخزمەتکارەکانی وتیان ئەوکورِە کۆرپەلەیە ئیسرِائیلی یە پاشاهەردەبێ سەری ببرِ ێ٠کەشاژن منداڵەکەی بینی خۆشەویستی کۆرپەلەکە چووە دڵییەوە ونای بەسینگییەوە و ماچی کرد٠شاژن لەلای پاشا تکای بۆکرد ، وتی : ئەم منداڵە بەرچاو رِونییە بۆمن و بۆتۆ مەیکوژە لەوانەیە سوودمان پێ بگەیەنێت یان دەیکەینە منداڵی خۆمان٠بەوشێوەیە موسا کورِی عیمران چووە ناوکۆشکی فیرعەون و شاژن داوای کرد دایەن بێت وشیری بداتێ ئافرە تی دایەنیان بۆهێنا ومنداڵەکەیان دەخستە کۆشی ، بەڵام منداڵەکە دەگریاورِووی وەردەگێرِا**

شاژن داوای گۆڕینی دایەنەکەی دەکرد و دایەنێکی تریان هێنا ، بەلاَم هەردەگریاوڕووی وەر دەگێڕا و شیری ئەودایەنانەی نەدەخوارد بەم شێوەیەچەندڕۆژێك تێپەڕبووشیری نەخوارد٠ خوشکەکەی موساچووە دەرەوە بەرگوێی کەوت کەواخەڵکی باسی منداڵێکی زۆرجوان دەکەن لەناوکۆشکی پاشا کاتێ کەئەوقسانەی بیست وتی من لەشارەکەدا ئافرەتێك دەناسم دڵنیام ، کەئەومنداڵە شیری ئەوئافرەتە دەخوات٠ژنێکی ناوکۆشکەکە وتی : من تائێستا شەش دایەنم بۆتاقیکردۆتەوە شیری هیچیانی نەخواردووە، ژنێکی تروتی قەیناکە با دایەنی حەوتەمیش تاقی بکەینەوە ، شاژن وتی : بڕۆئەوژنە لەگەڵ خۆت بهێنە٠کەدایکی موسا هات موسای کۆر پەلەیان دایەدەستی منداڵەکە ڕازی بوو کەشیری ئەوبخوات٠فیرعەون وتی : دیارە ئەوژنە دا یکی خۆیەتی ئەگینا هۆی چییە ئەومنداڵە شیری ئەوژنەی گرت ؟ دایکی موسا وتی : من ئا فرەتێکم بۆنی شیرەکەم خۆشە بۆیە هەموو منداڵێك شیری من دەخوات ، فیرعەون بێدەنگ بوو موسای لەباوەش کردوگەڕایەوە ماڵی خۆیان٠

**وانەی سی ودووەم - پێنج نیشانەکە :**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

{فأرسلنا عليهم الطوفان والجراد والقمل والضفادع والدم ايات مفصلات فاستكبروا وكانوا قوما مجرمين} الأعراف :١٣٣

**خوای گەورە بارانی بەسەردادەباراندن لافاوی نیل هەڵسا لەئاسمانەوە باران باری باری هەتا وای لێهات هەمووکشتوکاڵ و بەروبوومیان سەرئاوکەوت ، هەموو تەڕبوو ، ڕزی خوسابوون ئەمجارە بارانەکە بووبەبەلاّ بۆیان هەروەکو لەبێ بارانی دا بێتاقەت بوون لەوئاوە زۆرەش زیانیان پێگەیشت٠ئینجا خوای گەورە کوللەی باراند بەسەریان دا واتا کولله هینده زۆربوو هەمووبەروبووم و دانەوێڵەکەیانی خوارد٠ئەمجارە خوای گەورە ئەسپێی زاڵ کرد بەسەریا ن دا ئەسپێ لەجێگایەکانیان دا ، ئەسپێ لەجلیان دا ، لەسەریان دا ، لەناولاشەیان دا شەو شەونەدەخەوتن لەبەرئەسپێ فرێدان و کوشتنی هەتا بەیانی٠ئەمجارە خوای گەورە بەلاّ یەکی تری بۆناردن ئەویش بۆق بوو لەخواردنەوەیان دا بۆق بوو ، لەناوخواردنیان دا بۆ ق بوو ، لەناوجلەکانیان دا بۆق بوو ئەم بۆقانە ژیانی لێ تاڵ کردبوون لەهەموو سووچ و قوژبنێکی ماڵەکەیان دا بۆق بلاّوبووبووەوە ، لەدوایی دا خوای گەورە نیشانەی پێنجەمی بۆناردن ئەویش خوێن بوو ، لەلووتیانەوە خوێن فوارەی دەکرد ، ئاوەکانیان لێ بووبووە خوێن ، هەتا هیلاکی کردن کەبەلاّیەکیان دەدیت بەحەزرەتی موسایان دەوت داوامان بۆ بکە خوا ئەم بەلاّیەمان لەسەرلاببات ئیترتۆبە دەکەین و باوەڕدەهێنین هەمووجارێ دەیا ن ووت : ئەگەرئەم بەلاّیەمان لەسەرلابچێت ئەوە ئیمان دەهێنین ، بەلاّم کاتێك بەلاّکەله سەریان لادەچوو هەرلەسەربێباوەڕی خۆیان دەمانەوە٠**

وانەی سی و سێیەم - کارەچاکەکانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (خوالێی ڕازی بێ) :
عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەنەوەی پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب)ە (خوالێی ڕازی بێ) لەدایکییەوە٠

١ — ڕۆژێکیان داوایان لەخەلیفەکرد ، کەهەندێك ماڵی دەوڵەت سەرف بکرێت بۆبەرگی نوێ بۆکەعبە ، وتی : من وای بەباش دەزانم ، کەئەوپارەیە زگی برسی پێ تێربکرێ و ڕەش و ڕووتی پێ پۆشاك بکرێ باشترە لەبەرگی نوێ بۆکەعبە٠

٢ — ڕۆژێکیان نوسراوێکی بۆیەکێك لەوالی یەکان نارد ، کەتێی دا هاتبوو : ((ئەوانەی لێت ناڕازین ژمارەیان زۆربووە ، ئەوانەی کەلێت ڕازین ژمارەیان کەمە کەواتە یان خۆت چاك بکە یان ئیستیقالە بدە))٠

٣ — والی هەبووە نەفەری دەستگیرکردووە بەتۆمەتی ئەوەی قسەی نەشیاوی بەخەلیفە وتو وە ، کاتێ والی یەکە خستوویەتییە بەندیخانەوە نوسراوی بۆخەلیفە ڕەوانەکردووە هەواڵە کەی پێڕاگەیاندووەونووسیویەتی : ئەوەندەی نەمابوو بیکوژم ، خەلیفەکاتێ نامەکەی خو ێندۆتەوە وەلآمی دایەوە : سوێندبەخوا (جل جلاله) ئەگەربتکوشتبایە دەم کوشتییەوە٠

٤ — دەیووت : ئەمن بەرپرسیارم لەماڵی موسوڵمانان ، ماڵی دەوڵەت مولکی گشتی یە هی هەمووتاکێکی ئوممەتە ، هی بێوەژنە ، هی یەتیمە ، هی منداڵ و شیرەخۆرەیە ، هی هەژارا ن و پەککەوتەونەخۆشەکانە٠

٥ — تاوەکوهەدیەی وەرنەدەگرت ، ڕۆژێکیان هەدیەکی بۆهات قبولی نەکرد٠پێیان وت : بۆ چی وەری ناگرێ لەکاتێکدا درودی خوای لەسەربێ هەدیەی وەردەگرت ؟ ئەویش وتی : ڕا ستە ، بەلآم بۆئەوهەدیەبوو ، بەلآم بۆئێمە بەرتیلە٠

٦ — عونبوسەی کوڕی سەعید یەکێك بوو لەنزیکەکانی ، ڕۆژێکیان هاتەلای داوایەکی تایبە تی لێ کرد٠خەلیفەش وتی : پێم بلێ ئەی عونبوسە تۆموحتاجی ؟ وتی : نەخێر٠وتی : قە رزاری ؟ وتی : نەخێر٠وتی : ئەی چۆن داوادەکەی ماڵت پێ بدەم ؟ ئەگەرموحتاج بای پێو یستییەکتم بۆت جێ بەجێ دەکرد ، ئەگەرقەرزاربای قەرزەکەتم بۆت دەدایەوە٠داوات لێ د ە کەم ئەوەندەی هەتە قەناعەتت هەبێ ، لەخواش بترسە بزانە لەچ ڕێگایەك کۆت کردۆتە

وه ، لێپرسینەوه لەگەڵ خۆت بکه پێش ئەوەی خوا (جل جلاله)لیٚ پرسینەوەت لەگەڵ بکا ت ئابەم شێوەیه خزم و برادەرایەتی نەی دەخوارد٠

٧ – نوسراوی دەنارد بۆوالی یەکان پێی دەوتن پێویسته هەمووموسوڵمانێك : (خانوێکی هه بیٚ لەناوی بحەوێتەوه ، ولاغێکی هەبیٚ جیهادلەسەرپشتی بکا ، کەل و پەلی زەروری ناوماڵی بۆدابین بکریٚ ، خێزانی بۆببیٚ ئەگەرخۆی ویستی لەسەربیٚ ، هەرکەسێك قەرزاربوو قەرز ی بۆبدەنەوه)٠

٨ – فەرمانی دەکرد هەرنابینایەك کەسێکی بۆدەست گرتن لەسەرحیسابی دەوڵەت بۆبگیریٚ

٩ – هەموونەخۆشێك خزمەتکارێکی بۆدانا لەسەرحیسابی دەوڵەت٠

١٠ – بەشەئازووقەی بۆمنداڵ دانا٠تاوای لیٚهات دەوڵەمەند فەقیرێکیان دەست نەدەکەوت زه کاتی بدەنیٚ٠

١١ – جارێکیان ئافرەتێك نوسراوێکی بۆنارد کەلەبەرکورتی دیواری حەوشەی ماڵەکەی بەو هۆیەوه مریشکەکانی لیٚ دەدزرێت ، خەلیفەش نوسراوێکی کرد ، کەدیواری ماڵەکەی بۆچاك بکەن و دیوارەکەی بۆبەرزبکەنەوه٠

١٢ – نوسراوی کرد بۆوالی میصرٍ کەبار لەسەرپشتی حوشترزیاد لەتاقەت و توانای خۆیان لیٚ نەدەن باری قورسی قەدەغەکرد کەلەسەرپشتی وشتر زیاده قورسایی بارنەکریٚ واتا دادوەری خەلیفه ئاژەڵیشی گرتبووەوه٠

**زانیاری گشتی :**

**⋆وشەی (سؤال) لەقورئانی پیرۆزدا بەپێی ئایەتەکە مانای دەگۆڕێت٠لەزمانی کوردی دا کە سێك داوای پارەوشتومەك بکات پێی دەوترێت (سوالکەر) ئەگەربوترێت پرسیارکەر بێ مانا یە ، هەندێ جاربەمانای پرسیارکردن دێت ، هەندێ جاریش بەمانای داواکردن دێت٠**

**⋆مانای وشەی ئیسلام :**

**ئاینی ئیسلام ئاینی هەمووپێخەمبەرانە بەتایبەتی پێخەمبەرئیبراهیم (علیه السلام)٠ ئیسلام وەك ناوئاینی پێخەمبەر(محمد – درودی خوای لەسەربێ) ، بەلأم ئەوئیسلامەی وە صفی حەزرەتی ئیبراهیمی پێدەکرێت ملکەچ بوون و خۆدانەدەست خوای گەورەیە لەقورئا ن دا خوای گەورە لەسەرزمانی حەزرەتی ئیبراهیم (علیەالسلام) دەفەرموێ :** { وأنا أول المسلمين}

**مەبەست لەیەکەم موسولْمانی حەزرەتی ئیبراهیم (علیەالسلام) ئەوەیە ئەویەکەم کەس بوو ەلەهۆزەکەی خۆی بتپەرستی وەلاناوخودای تاك و تەنیای پەرست٠**

**لبیك : واتا ئامادەوفەرمانبەرم لەخزمەت دام٠**

**⋆ئاینی بەهائی :**

**دامەزرێنەری ئەم ئاینەکەسێکە بەناوی(میرزامحەممەد عەلی نوری)کەناسراوە بە**(بهاء الله) **کەلەبنچینەدا موسولْمانێکی شیعەبووە لەسالْی (١٨١٧)لەئێران لەدایکبووە ، لەسالْی (١٨٩٢)مر دووە٠ئەم ئاینەلەولأتی ئێران سەری هەلْداوەوخۆی وەك پەیامبەرناساندووە٠پەرتووکی (ئە قدەس) کەیەکێکە لەبەرهەمەکانی (میرزامحەممەد) پەرتووکی ئاینییانە٠**

**لەئاینی بەهائی دا دوای تەمەنی پانزەسالْی نوێژکردن واجب دەبێ وسێ نوێژیشی دیاری کر دووە بەئارەزووی خۆیان یەکێکی هەلْدەبژێرن ، هەروەها دواین مانگی سالْ بەڕۆژوو دەبن و ئەم ئاینە دەستکردی مرۆڤەکانە٠**

**⋆زنجیرەکارتۆنی گراندەیزەر(یوفۆ) :**

**ئەم زنجیرەکارتۆنییە بەزمانی ژاپۆنی (یوفۆ) واتا (یوئێف ئۆرۆبۆچوریندایزا) ، کەلەسەرە تای سالأنی هەشتاکانەوە لەعیراق و زۆربەی ولأتانی عەرەبی پەخش کرا لە(٧٤)حەفتاوچوا رزنجیرە پێکهاتبوو کەبۆزمانی عەرەبی دۆبلاژکرابوو ئەوەندەی لەولأتانی عەرەبی سەرکەو تووبوو لەولأتی ژاپۆن ئەوەندە سەرکەوتوونەبوو٠**

چیرۆکی ئەم زنجیرەیە ڤێگای گەورە سەرۆکی بۆشایی ئاسمانە و هەمیشەلەناوکەشتییەکەی خۆی هەمیشەلەناوکەشتییەکەی خۆی لەبۆشایی ئاسمان نیشتەجێ یە وحەزی لەشەڕەومە ترسی بۆسەرزەوی هەیە ئامانجی ئەوەیەدەست بگرێت بەسەرتەواوی دنیادا بۆئەومەبەستە ش سەربازەکانی خۆی کەمرۆڤی ئالی وڕۆبۆتن بۆهێرش کردن بەکاردێنێت٠

ڕۆژێك لەڕۆژان ڤێگای گەورە هێرش دەکاتەسەرهەسارەی (فلید)ی ئاشتی خواز ، بەلاّم دۆق فیلد ، کەکوڕی پاشای هەسارەکەدەبێت دەتوانێت گراندەیزەر ، کەبەشێوەیەکی زانستی زۆر پێشکەوتوودروستکراوە بڕفێنێت و هەڵبێت لەدەستیان٠

دوای چەند ڕۆژێك گەڕان لەبۆشایی ئاسمان دا ، دۆق و گراندەیزەردەکەونە خوارەوە خۆیان لەهەسارەی زەوی دەبیننەوە٠لەسەرزەویش (د٠ئامون)سەرۆکی سەنتەری لێکۆڵینەوەی بۆشا یی ئاسمانە لەژاپۆن (یابان) ، دۆق فلیدوگراندەیزەردەدۆزێتەوە ، دۆق فلید دەکات بەکوڕی خۆی و بەخێوی دەکات ونهێنی چیرۆکەکەی لای کەس باس ناکات وناوی دەنێت: (دایسکی)٠ ڤێگەی گەورە پلانی خۆی بۆهێرش کردنە سەرزەوی دادەڕێژێت ، بەلاّم لەناکاوتووشی شۆك دەبێت ، کەدەبینێت گراندەیزەرلەسەرزەوی یە٠

چەندهاوکارێکی گراندەیزەر هەیە بۆڕوبەڕووبوونەوەی هێرشەکانی ڤێگای گەورە، ئەوانیش (کۆجی ، هیکارۆ ، ماریا کەخوشکی دۆق فلیدە)٠لەکۆتایی زنجیرەکەدا دۆق فلید وهاوڕێکانی دەتوانن شکست بەڤێگای گەورە بهێنن وسەرکەون بەسەری دا٠لەدوازنجیرەش دا دۆق فلیدو ماریای خۆشکی زەوی بەجێ دەهێڵن و بەرەوزێدی خۆیان کەهەسارەی (فیلد)ە دەگەڕێنەوە ، بەلاّم بەڵێن بەهاوڕێکانیان دەدەن ، کەڕۆژێك لەڕۆژان بگەڕێنەوەلایان٠

دەرهێنەری زنجیرەکە هەردوودەرهێنەری بەناوبانگی ژاپۆن (کاتسۆمیتاتەماهی و ئەکیمی مایازاکی)یە٠

بەرواری بەرهەمهێنانی(١٩٧٥/١٠/٢) ، بەرواری کۆتایی بەرهەمەکە(١٩٧٧/٢/٢٧)٠یەکێك لەهۆ یەکانی سەرکەوتنی ئەم زنجیرەیە وەرگێڕانە عەرەبییەکەیەتی کەبەشێوەیەکی باش و سەر نجڕاکێش لەلایەن هونەرمەندانی لوبنانی وەرگێڕراوە٠(لەگۆڤاری ڕۆژی سلێمانی ژمارە (٢٦ – ٢٧)ی ساڵی (٢٠١٥) وەرگیراوە)٠

⋆زنجیرەکارتۆنی نیلز :

ئەم چیرۆکە خانمەنوسەری سویدی(سیلما لیکرلوف)نوسیویەتی ، کەبراوەی خەلاتی (نۆبڵ)
٥٠سیلما لەتەمەنی منداڵییەوە تووشی نەخۆشییەك دەبێت ئەمەش وای لێدەکات زۆردا -
بنیشێت و گوێ لەچیرۆکەکان بگرێت٠

(سلیما)لەخێزانێك گەورەبووە کەخاوەنی پارچەزەوییەك دەبن و ئاژەڵی تێدابەخێودەکەن
لەدوای (١٠)ساڵی کارکردن وەك مامۆستا بووەنوسەروکتێبەکانی لەزۆربەی شوێنەکان بلاّو
کرانەوە ، بەهۆی ناوازەیی وجوانی نووسینەکانی ناوبانگی دەرکرد٠

ئەم چیرۆکەی بەجۆرێك نووسیووە، کەلەگەڵ عەقلی منداڵ بگونجێ بۆئەوەی منداڵان شارە
زابن لەزانستی جوگرافیا ، چونکەوانەی جوگرافیالە(سوید)زۆربێ بایەخ بووبوو لەلایەن قو
تابیانەوە ، قوتابیان پێیان وابوو ئەوزانستە وشکە ، سەرەنجام کتێبی(نیلزهولکرسونس وگە
شتەناوازەکەی بەرەوسوید) لەساڵی (١٩٠٦)بەرهەمهێنرا٠

ئەم کتێبە تەنهامنداڵ نەی دەخوێندەوە ، بەڵکوگەورەکانیش تامەزرۆی بوون٠بۆزیاترلەدوا
نزە زمان وەرگێڕدرا دواترکرایە زنجیرەکارتۆنێك ، کەزۆرچێژی لێ دەبینرا بۆیەیەکێك لە
دراوەکانی سوید کەدراوێکی بیست کرۆنی یە وێنەی ئەم خانمەنووسەرەونیلز و مۆرتۆن لە
خۆدەگرێت٠ (لەگۆڤاری ڕۆژی سلێمانی ژمارە (٢٦ — ٢٧)ی ساڵی (٢٠١٥) وەرگیراوە)٠

⋆دەروون دروستی :

بریتییە لەتەندروستی دەروون بەوەی کەواهیچ نەخۆشییەکی دەروونی نییە وهەستکردن
بەکامەرانی٠

⋆وشەی شووکردن لەچییەوە هاتووە ؟

شوو لەکرمانجی خواروو ، شڤ لەکرمانجی ژووروو (سەروو) واتا (دار)٠شوو لکی تەڕوناسکی
دارودرەختە ، کەتەواو پێگەیشتووە دەشێ ببڕدرێ و بەدەستەوە بگیرێ و بکرێ بەداردەست
شوولکەداریش هەرئەولکەدارەیە کەبڕاوە بەدەستەوە دەگیرێ٠

وشەی (شوان) ، (شڤان)یش هەرلەمەوە هاتووە بەواتای دارەوان ، داربەدەست ، کە بۆئاژو
شتنی مەڕومالاّت بەکاردێ واتا ئافرەتیش دێتە ژێرسایەی ئەم دارە ، دەبێ گوێ بەفەرما
نی ئەم دارەبدات٠

ئەگەرسەرنج بدەینە وشەی شووکردن تەنیا بۆئافرەت بەکاردێ نەك پیاو لەبەرئەوەی ئا فرەت دەچێتەژێرسایەی دەسەڵاتی پیاونەك بەپێچەوانەوە٠(سەرچاوە : گۆڤاری شاووشکا ، ژمارە (١) ساڵی ٢٠٠١ )٠

⋆گلەزەردە :

کێوێکە کەوتۆتە خۆرئاوای شاری سلێمانی ونزیکەی (٣٥)کم لێوەی دوورە٠

⋆{الزانية والزاني فاجلدوا كل واحد منهما مائة جلدة} النور : ٢

لەم ئایەتەپیرۆزەدا (الزانیە) پێش (الزانی) هاتووە بەپێچەوانەی دزی ، کە (السارق) پێش (السارقە)هاتووە ، چونکەداوێنپیسی لەژن دا قێزەونترە ، چونکە ئابڕووی خۆی ومێردەکە ی و بنەماڵەکەی دەبات ، بەڵام دزی پیاو زیاترئەنجامی دەدات٠

⋆شارەوانیی : واتادەزگای شارەوانی ، بەبێ بوونی (ی)دووەم واتای دەزگاودامەزراوە ناگەیە نێت٠

شارەوان : واتاسەرۆکی شارەوانی ، ئەگەرمانای دەزگابگەیەنێت دەبێ دوو(ی) بنووسرێت وا تا بەم شێوەیە : شارەوانیی٠

⋆وشەی نەشتەرگەریی ، ئەگەربنوسرێ ژووری نەشتەرگەریی دەبێ دوو(ی) بنوسرێ٠

نەشتەرگەر واتا پزیشك٠

⋆ئەگەربوترێ فلاَنە کەس نەخۆشی هەیە واتا یەکێك لەئەندامانیماڵەوەیان نەخۆشە ، بە لاَم ئەگەربنوسرێ نەخۆشیی هەیە واتا بەخۆی نەخۆشە٠

⋆گۆتە :

شاعیرێکی ئەڵمانی یە ، ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی خوێندۆتەوە کەوەرگێڕدرابوونە سەرزمانی لا – تینی و ئەڵمانی٠کاریگەربووە بەبەرهەمەکانی شاعیری ئێرانی (سەعدی شیرازی) ، کەشاعیر ێکی سۆفیگەری بووە ، لەرێی ئەوەوە ئاشنایەتی لەگەڵ ئاینی ئیسلام پەیداکردووە٠هەروەها گۆتە لەبەرهەمەکانی دا ئاماژەی بۆشاعیرێك کردووە ، کەناسناوی (نیشانی)یە کەدیارە مەلا ی جزیری دووناسناوی هەبووە : جزیری و نیشانی٠

گۆتەلەساڵی (١٧٧٢) چاوی بەوەرگێڕدراوێکی لاتینی قورئانی پیرۆزدەکەوێت،کەلەساڵی(١٤٢٣) لە(بازل) لەلایەن (تیۆدۆربی بلیاندر)ەوە بەچاپ گەیشتووە و (مارتن لۆسەر) پێشەکی بۆنو

وسیووه٠

چەندنموونەیەك لەهۆنراوەکانی گۆتە :

خودای تەنیا هەریەکێکە

خودای تاقانە بێ خەوشێکە

نەلەدایك بووە و

نەکەسی لێ بووە

گۆتە سورەتی (الاخلاص)ی بەهۆنراوە دارشتووە ، کەخودای گەورە دەفەرمووێ : {قل هو الله أحد الله الصمد لم یلد ولم یولد ولم یکن له کفوا أحد}

نموونەیەکی تر :

خوداوەندی دوورۆژهەلأت

خوداوەندی دوورۆژئاوا

دەی کام یەکێك لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان

بەدرۆدەزانن ؟

گۆتە لەم هۆنراوەیەی دا ئایەتی (١٧) و (١٨)ی سورەتی (الرحمن)ی بەهۆنراوە دارشتووە٠ {رب المشرقین ورب المغربین فبأی الاء ربکما تکذبان} الرحمن : ١٧ ــ ١٨

نموونەیەکی تر :

خودائەستێرەکانی دروستکردووە

هەتاکورێنمایی ئێوەبن

لەدەریاولەوشکانی دا

گۆتەئایەتی (١٦)ی سورەتی (النحل)ی هێناوەبەهۆنراوە دای رشتووە ، کەخودای گەورە دەفە رمووێ : {وعلامات وبالنجم هم یهتدون} النحل : ١٦ (سەرچاوە : گۆڤاری خۆری ئیسلام ، ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٩٨)٠

★نوری فارس حەمەخان :

ئەم نوسەرە لەساڵی (١٩٣٥) لەگوندی (برایماوە)ی قەرەداغ لەدایکبووە٠لەساڵی (١٩٦١) دەستی کردووە بەنووسین لەبواری شیعروئەدەبیاتی ئاینی و وەرگێران ، لەبەرهەمەکانی : (وەرگێر انی (البؤساء)ی ڤیکتۆرهۆگۆ ، عەروزی کوردی ، ٠٠٠تاد)٠

★وشەی ئەدەب دوومانای هەیە ، یەکەمیان بەواتای چیرۆك و شیعربەکاردی ، دووەمیان بە واتای ئەخلاق دێ٠

★وشەی عام دوومانای هەیە ، یەکەمیان بەواتای سالْ دێ، دووەمیان بەواتای گشت ، هەموو٠

★بۆتە :

ئەوگلْنەکەیە کەزێڕینگەرەکان بۆتواندنەوەی زێڕەکانیان بەکاری دێنن بەشلەیی شێوازێکی تری لێ دروست دەکەن٠

★زەیستانی : بەوخوێنەدەوترێ کەژن لەکاتی منداڵبوون و لەدوای منداڵبوون دەیبینێ٠

★نیەت : نیاز

★محەممەد ئەربیلی :

لەسالْی (١٩٣٣) لەگەڕەکی تەعجیل لەدایکبووە ، لەسالْی (١٩٤٤) بۆیەکەمجار ئاوازی بۆسرودی (هەولێرشاری شیرینم)داناوە ، کەئەوکاتە لەقوتابخانەی (ئەربیلی ئولا) لەپۆلی دووەمی سەرەتایی بۆپۆلی سێیەم دەرچووە٠هاندەریشی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان مامۆستای خوالێ — خۆش بێت (عیزەددین فەیزی)بووە ، مامۆستای سرودیشیان جەمیل ئەفەندی بووە٠

★چلاواز :

ناوی ئامێرێکی موزیکی ئەفسانەییە ، مەبەست ناوی ئامێرەکەیە نەك ژمارە ، کەژمارەی — چل ئاوازبێ٠

★پاساو :

دۆزینەوەی هۆکارێکە بەرگری لەخۆی دەکات بۆنموونە قوتابی لەتاقیکردنەوە نمرەی خراپ دەهێنێت دەڵێ : تاقیکردنەوەکە گران بوو٠

★کاك : ناوێکی واتاییە بۆکەسێ بەکاردەهێنرێت کە ڕێزی لێ دەگیرێت لەڕووی واتاوە بەمانا ی بەرێزیان براگەورەدێت٠لەزمانی عەرەبی دا بەرامبەروشەی (سید)دێت، لەزمانی ئینگلیز یش دا بەرامبەروشەی (مستەر) دێ و لەزمانی فارسیش دا بەرامبەروشەی (ئاغا)دێ ، بۆنمو ونە : کاکم هاتەوە٠واتا براگەورەکەم گەڕاوە٠ کە دەڵێی : کاك هیواچۆنی ؟ وەك ئاوەڵناوێك بەکارهێنراوە بۆڕێزلێنان٠هەروەهاوشەی کاك وەك ڕاناوی نادیاریش بەکاردەهێنرێت بۆنمو ونە کەدەڵێی : کاکەوەرە٠وەك بلْێی : سیروان وەرە٠(سەرچاوە : گۆڤاری پێشکەوتن ژمارە ٨٦

ی ساڵی ١٩٩٩)٠

★پرۆفیسۆرێکی بەریتانی بەناوی (رۆن ئیکلیز) دەڵێ : هەرمرۆڤێکی ئاسایی تاتەمەنی دەگا تە (٧٥)ساڵ نزیکەی (٢٠٠) جار تووشی هەلاًمەت دەبێ ئەگەرکۆی بکەیتەوە واتاهەریەکێك لەئێمە لەماوەی ژیانی دا (٢ — ٣) ساڵ تووشی ئەونەخۆشییە سادەیەدەبێ٠

★تەنز : بەوئەدەبە دەوترێ کەبەشێوەیەکی کۆمیدی و گاڵتەئامێزوپێکەنیناوی رەخنەلەوا قیع دەگرێ و کەموکورتییەکانی دەست نیشان دەکات٠

*ء : ژمارە (٦)ە لەفارسی دا[٢]٠

*[٢]: ژمارە (٤)ە لەفارسی دا٠

★خاڵبەندی :

مەبەست لەخاڵبەندی ئەوهێمایانەیە ، کەلەنوسین دا بەکاردەهێنرێ ، هەرهێمایەش واتاو مەبەستێکی هەیە٠

١ — خاڵ (٠) : بۆکۆتایی پێهاتنی قسەورستەبەکاردەهێنرێ٠

٢ — فاریزە (،) : وچانێکە٠

٣ — خاڵ لەسەرخاڵ (:) : بۆروونکردنەوەی ئەوەی لەدوایەوەدێ٠

٤ — نیشانەی پرسیار (؟) : پاش پرسیاردادەنرێ٠

٥ — نیشانەی سەرسورمان (!) : پاش سەرسورمان و حەپەسان و تێرامان و ٠٠٠تاد٠

٦ — نیشانەی مەرج (-) : لەنێوان ژمارە و ژمێردراودادەنرێ٠

٧ — جووت کەوانە ((   )) : بۆرستەی خواستراوبەکاردەهێنرێ٠

٨ — نیشانەی لابردن (٠٠٠) : هەندێك جاروتەیەك دەخوازی بەلاًم پێویست بەهەمووی نا کات٠

★بەرزی :

بەرزی لەزمان دا بەچەندین واتادێ : (بەرزی شوێن ، بەرزی رێز ، بەرزی دەسەلاًت)٠

★خۆشترین نەغمە پێکەنینی منداڵە٠(محمدرافع)

★مەلاعەبدولکەریمی مودەریس :

ناوی (عبدالکریم)ە لەتیرەی(قازی) سەربەعەشیرەتی غەوارەیە٠مودەریس بەمانای وانە بێژ

ئەویش بەهۆی چەندین ساڵەی وانەوتنەوەی٠تەفسیرەکوردییەکەی بەناوی تەفسیری (نامی) یە ، نامی ناسناوی شیعریەتی و لەشیعرەکوردی و فارسی یەکان دا بەکاری هێناوە٠لەگوندی تەکیەی نزیك ناحیەی (خوڕماڵ)ی سەربەپارێزگای هەڵەبجە لەدایکبووە لەساڵی (١٩٠٣) یان (١٩٠٥)٠

★نەجران :

یەکێ لەشارەکانی یەمەن بووە ، بەڵام لەنەخشەی ئەمڕۆدا لەدەوڵەتی سعودیەیە و نزیك — سنوری یەمەن٠

★قامەت :

قامەت لەزمان دا واتا هەستان و ڕاوەستان ، لەزاراوەدا واتا هەستانەسەرپێ بۆئەنجامدانی نوێژی فەرزبەکۆمەڵ٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دەفەرمووێ : ((بين كل أذانين صلا ة)) رواه البخاري٠

واتا : ((لەنێوان هەردوو بانگێك دا نوێژهەیە))٠ مەبەست ئەوەیە لەبانگی یەکەم بانگ بێژ خەڵکەکەی پێ بانگ دەکات بۆنوێژی بەکۆمەڵ ، وە لەبانگی دووەم دا خەڵکەکەی پێ ئاگادا ردەکاتەوە بەهەستانەسەرپێ بۆئەنجام دانی نوێژی فەرزی بەکۆمەڵ٠

★پەرلەمان وشەیەکی فەڕەنسی یە لە(پارل) واتا قسەکردن و(مان)کەپاشگرە واتا جێگەی و تووویژ٠

★وشەی زاراوە لەوشەی (زار) هاتووە واتا قسە وەك زاری کرمانجی ٠٠٠

★بەحرێن :

وشەی بەحرێن بەمانای دوودەریادێت ، چونکەدەکەوێتە نێوان دەریای عەرەب لە خۆرهەلا ت و کەنداوی فارسی یان عەرەبی لەخۆرئاواوە ، پایتەختەکەی شاری (مەنامە)یە و لەساڵی ١٩٧١ سەربەخۆیی وەرگرتووە٠

★وەلی ئەمر : بەرپرسی خێزان

★ڕەمەك : غەریزە

★لەمەڕ : دەربارەی ، سەبارەت

★فرزندە : منداڵ ، ڕۆڵە

★بەکەسێ بلێ زانا و زیرەك

**حوبب وبوغزی کەس لای نەدا لەحەق (شاعێرێکی نەزانراو)**

**★دڵێ نەناڵێ بۆهیچ نەخۆشێ**

**ئازاری نەبێ بۆدڵ پەرۆشێ**

**هەربۆئارەزووی خۆی تێبکۆشێ**

**بۆزامێکی هۆز زوخی نەنۆشێ**

**یاخوائەودڵە هەرئاوارەبێ**

**بەتیغی دوژمن پارەپارەبێ (قانیع)**

**★وشەی** (الوسیلة) **مانای** (الواسطة) **واتا (هۆ) ، ئەم هۆیەش دەبێتە هۆی نزیکبوونەوە لە خوای گەورە ، هەروەها بەمانای نزیکبوونەوە لەخوای گەورە :** {وابتغوا الیه الوسیلة} الما ئدة : ٣٥

**واتا : (خۆتان لەخودا (جل جلاله) نزیك بکەنەوە بە وەسیلە ، مەبەستیش لەوەسیلە کردە وەی چاکە ، هەروەها (توسل) بەناوەپیرۆزەکانی خودا (جل جلاله) هۆیەکە بۆگیرابوونی دو عا٠**

**ئەوسێ کەسەی دەرگای ئەشکەوتیان لەسەرداخرا ، یەکێ لەوان (توسل)ی کرد بۆلای خوای - گەورە بەچاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکی ، دووەمیان بەدوورکەوتنەوەی لەزینا لەدوای ئەو ەی کەبۆی ڕەخسابوو ، سێیەمیان بەدەستپاکییەکەی کەماڵی کەسێکی پاراستبوو بەتەواوی - دابوویەوە بەخاوەنەکەی٠ئینجا کە(توسل)یان کرد بەم کارەچاکانە خوای گەورە ناخۆشییە کەی لەسەرلابردن٠**

**★محمدقوتب : ئەم نوسەرە برای (سیدقوتب)ە ، لەساڵی (١٩١٩) لەشارۆچکەی موشای سەربە پارێزگای ئەسیوط لەدایکبووە٠خاوەن بەرهەمێکی زۆرە لەوانە : (جاهلیة** قرن العشرین ، **شبهات حول الاسلام** ، محرکة التقلید ، کیف نکتب التأریخ الاسلامی؟، المسلمون والعو لمة ، من قضایا الفکرالاسلامی المعاصر ، دروس التربویة من القران الکریم ، **... هتد)٠**

**★ناوی ئیبراهیم لەدوو وشەپێکهاتووە : (برا + یم) واتا (برای من) (هەڵەیە)٠لەزمانی کورد ی ناوبچووك دەکرێتەوە بۆئاسانی گۆکردن وەك :**

**شمس الدین دەبێتە شەمدین**

زین الدین دەبێتە زێن دین

ئیسماعیل دەبێتە سمایل

ئیبراهیم دەبێتە برایم

تێبینی : قورئانی پیرۆزباسی نەکردووە حەزرەتی ئیبراهیم لەناوچ نەتەوەیەك پەیدابووە باس نەکرنیشی حیکمەتی تێدایە ، یاخود باوکە ئادەم (سەلامی خوای لێ بێ)بەچ زمانێك دواوە ؟ حەزرەتی ئیسماعیلیش لەناوعەرەبان فێری زمانی ئەوان بوو ژنی لەوان هێنا وز مانی گۆڕا٠

ئیسماعیل ناوێکی کوردی یە بەمانای ئاسمان وێڵ !!! (هەڵەیە)٠

ئیسماعیل ناوێکی عیبری یە بەمانای خوادەبیستێ٠

ئیسحاق ناوێکی عیبری یە بەمانای پێکەنین٠

یەعقوب ناوێکی عیبری یە بەمانای لەدواهاتن٠

یوسف ناوێکی عیبری یە بەمانای جوان٠

ئیبراهیم بەسریانی بەمانای باوکێکی بەبەزەیی٠(بڕوانە : جلاء الأفهام)

*مەقامی ئیبراهیم (علیەالسلام) :

وشەی (المقام) لەزمانەوانی دا بەواتای (شوێن پێ)دێت٠مەقامی ئیبراهیم بەردێکی گەورەیە جێگای شوێن پێی حەزرەتی (ئیبراهیم)ە (علیەالسلام) دیارەبەئەمری خوای گەورە نەقشی لەسەربەستووە ، ئەم بەردە لەکاتی دروستکردنی بەیت ، حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوا ی لێبێ)لەسەری ڕاوەستاوەوشوێن پێیەکانی دیارە٠

*مزدلفە :

شوێنێکی گەورەوفراوانە نزیك مینایە ، هەروەها مشعرالحرامی لێیە و حاجی شەولەوێ دە مینێتەوە٠

*ایام التشریق :

بۆیە بەوناوە ناونراوە ، چونکە لەوڕۆژانەدا گۆشتی قوربانییان تێدادەبرژێت و بڵاودەکر ێتەوە یان گۆشتەکە لەسەربەرددانێن لەبەرگەرمی دەبرژێت ، سێ ڕۆژی پاش جەژنی قو ربانە٠

**★عومره :**

**عومره لەزمان دا واتا سەردان وەکودەوترێت : (اعتمرفلان) واتاسەری لێداوبەسەری کرده وه ، لەزاراوەی شەرع دا سەردانی ماڵی خودایە لەغەیری کاتی حەج دا٠**

**★ئەشکەوتی سەور :**

**ئەوئەشکەوتەبوو ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لێ بێ) و ئیمامی ئەبوبەکرخۆیان تێداحەشا ردا لەکاتی هیجرەت دا، کەدەکەوێتە باشوری مزگەوتی حەرامەوە٠کەبێباوەڕەکان دەوری ئە شکەوتەکەیان دا دیتیان کۆترهێلانەی تیادروست کردووە و جالجالۆکە تەونی پیاهەڵچنیوە وتیان کەسی تیانییە٠** {ثاني اثنين اذهما في الغاراذ يقول لصاحبه لاتحزن ان الله معنا} التوبة : ٤٠

**★ماراسۆن :**

**یاری ڕاکردن ، کەڕێگایەکی دووردەبڕن٠**

**★لەجیاتی (زاینی) بنوسرێ (لەدایکبوون)٠**

**★کوالیتی ژیان : بریتی یە لەئاستی بەختەوەری مرۆڤ بەخۆشی ژیان نەك درێژی تەمەن٠**

**★شیزۆفرینیا :**

**زاراوەی شیزۆفرینیا لەدوو وشە پێکهاتووە : شیزۆ بەمانای کەرت دێت ، فرینیا بەمانای ژ یری دێت٠لەزمانی عەرەبی پێی دەوترێ : الانقسام العقلی یان الانفصام العقلی٠نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە لەکردەوەی دەوروبەری گومان دەکات یان زوو هەڵدەچێت یان دەستدرێژی دەکاتەسەرکەسانی تر٠جاری وایە وادەزانێت خەڵك بەخراپە باسی دەکەن یان گاڵتەی پێدە کەن یان ژەهردەکەنە خواردنەکەیەوە٠**

**★سوڕەت :**

**سوڕەت لەزمان دا یانی ئەوشتەی کەلەزەوی بەرزبێتەوە ، (تسور) کەلەئایەت باسکراوە :** {اذتسورالمحراب} ص : ١١

**یانی چوونە سەرمیحراب یانی سەرکەوتن لەزمان دا بەمانای شوێنی بەرزوبڵنددێت٠هەند ێکی دیکە دەڵێن سورەت ، (**سوارة**)بووە بەمانای چواردەور (**احاطه**) ، لەشەرع دا سوڕەت بریتییە لەکۆمەڵێك ئایەت٠**

**ناوی سوڕەتەکان بەفەرمانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دانراوە٠ناوی سوڕەتەکان یا**

ن بەناوی سەرەتای دەست پێکردنییەتی وەك : طه ، یس ، ٠٠٠هتد٠یان بەدیارترین شت لە سورەتەکە وەك : البقرة ، ال عیمران ، ٠٠٠هتد٠ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز بریتی یە لە (١١٤)سورەت٠

*زانستەکانی قورئان (علوم القران) :-

١ – زانستی خوێندنەوەی تەجوید٠

٢ – زانستی تەفسیرولێکدانەوەی قورئان٠

٣ – زانستی ئایاتی ئەحکام و موتەشابیه٠

٤ – اعجازی قورئان٠

٥ – هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان (اسباب النزول)٠

٦ – زانینی ناسخ و مەنسوخ٠

٧ – اعرابی قورئان٠

٨ – بەلاغەی قورئان و چەندان شتی تر٠

*نەوامحەممەد سەعید :

ئەم نوسەرە لەساڵی (١٩٦٥) لەشارۆچکەی کۆیە لەدایك بووە ، نامیلکەوکتێبی زۆری چاپکرا وە٠

*لەکاتی خۆشوشتنی جەنابەت لەسەرەتای خۆشوشتن دەڵێی : بسم الله ، وەلەکۆتاییەکەی دەڵێی : اشهدأن لااله الاالله وحده لاشریك له ، واشهدأن محمدا عبده ورسوله ، اللهم اجعلنی من التوابین واجعلنی من المطهرین٠

*جیاوازییە لاشەییەکانی پیاووئافرەت :

١ – دڵی ئافرەت بچوکترە لەدڵی پیاو٠لەبەرئەوەیە خوای گەورە بڕیاری دەستبەردانی داوە تە دەست پیاو ، چونکە خۆگرترە لەژن و دڵی گەورەترە لەکاتی ناکۆکی و دووبەرەکێ – هیندە بەئاسانی بڕیاری دەست لێکبەردان نادات٠

٢ – خوێنی ئافرەت خڕۆکە سوورەکانی زیاترە ، هەروەها بڕەکەی کەمترە لەهی پیاو٠ خڕۆکەکانی خوێن دووجۆرن : (سپی و سوور) ، خڕۆکەسوورەکان ئەرکی گواستنەوەی ئۆ کسجین بۆخانەکانی لەش و گەڕانەوەی دوانەئۆکسیدی کاربۆن جێبەجێ دەکەن ، خڕۆکە

**سپییەکانیش ئەرکی بەرگری کردنی لەش دژی میکرۆبەکان جێبەجێ دەکەن۰**

**٭موجاهیدی کوڕی جەبر :**

**زانایەکی فەرموودەیە لەساڵی (١٠٢)ك لەمەککە وەفاتی کردووە لەعەشیرەتی مەخزومییە۰**

**٭مەحوی ناوی (مەلامحەممەدی کوڕی مەلاوەسمان)ە ، لەسەرەتادا ناسناوی (مەشوی)بووە بەمانای برژان، دوایی ناسناوی خۆی کردۆتە(مەحوی)بەمانای لەناوچوون لەخۆشەویستی سۆفیگەریانە۰**

**٭دەمامك (القناع) :**

**لەبنەڕەت دا دەمامك زاراوەیەکی شانۆیی بووە واپێناسەکراوە : (بریتی یە لەشێوەیەك لە شێوەکانی خۆگۆڕینی دەم و چاو ، پێناسی کەسەکە دەشارێتەوە و کەسێکی دی دروست دە کات)۰لەکۆمەڵگای کوردییش پیاوجەمەدانی کردۆتەدەمامك بۆئەوەی سەرمای نەبێ و سە رما دەم و بن گوێ و ڕوومەتی نەتەزێنێ۰**

**٭مرسی : شارێکە لەوڵاتی میصر۰**

**٭جونێدی بەغدادی :**

**یەکێکە لەصۆفییەکان بەڕەگەزخەڵکی (نەهاوەند)ە ، بەڵام لەعیراق گەورەبووە ، لەساڵی ( ٢٩٧)ك وەفاتی کردووە۰**

٭{سبحان الذي سخرلنا هذا وما كنا مقرنين وانا الى ربنا لمنقلبون} الزخرف : ١٢

**واتا : (پاکی و بێگەردی بۆئەوخوایەی ، کەئەم هۆکارانەی بۆڕام کردووین ۰۰۰)۰ئەم ئایەتە کاتێك دەخوێندرێت ، کەمرۆڤ سواری هۆیەکانی گواستنەوە دەبێ۰**

**٭ناوی تەواوی** (أبوالدرداء) **چییە ؟ وەڵام : عویمربن مالك بن قیس الانصاری۰**

**٭خاوەنی کتێبی** (ریاض الصالحین) **کێ یە ؟ وەڵام : یحیی بن شرف النووی۰**

**٭چەندفەرموودەهەیە لە (سنن ابوداود) ؟ وەڵام : (٤٨٠٠) چوارهەزاروهەشت سەد۰**

**٭دووەم ئافرەت کێ بوو کەموسوڵمان بوو ؟**

**وەڵام :** أم فضل ، **کەخێزانی عەباسی مامی پێخەمبەربوو(درودی خوای لەسەربێ)۰**

**٭ابوامامە ناوی چییە ؟ وەڵام : سعدبن سهل**

**٭پورەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ناویان چییە لەدایکی یەوە ؟**

**وەلاّم : فاخیتە ، فەرایسە٠**

**★پورەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ناویان چییە لەباوکی یەوە ؟**

**وەلاّم : سەعدیە ، عاتیکە ، ئەڕوا ، ئومەیە ،** بیزاء ، براء٠

**★تەراویح :**

**ئەم نوێژە بەکۆمەڵ دەکرێت لەشەوانی ڕەمەزان تەراویح کۆی وشەی (تەرویح)ە ، واتا ئیسراحەت٠خەڵکی بەجیاجیا نوێژی تەراویحیان دەکرد ، بەلاّم پێشەوا عومەر(خوای لێ ڕازی بێ) وتی : من وای بەچاك دەزانم ئەگەرئەم خەڵکە کۆبکەمەوە لەدوای یەك پێش نو ێژ باشترە لەوپەرتەوازەییە ، وە وتی :** (نعم البدعة هذه والتي ينامون عنها أفضل من — التي يقومون) **٠واتا : (باشترین داهێنراوە ئەمە وە ئەوتەراویحەی پێشتردەنوون دوایی بۆی هەڵدەستنەوە باشترەلەوەی لەسەرەتاکەی شەوئەنجامی دەدەن)٠**

**کاتی ئەنجام دانی تەراویح لەدوای نوێژی عیشایە تاوەکوپێش نوێژی بەیانی وەئەنجام دانی لەدوای نیوەشەوباشترە لەسەرەتاکەی شەو٠چاکترینیشیان (١١)یانزە ڕکەعەتە ، کەئەم ژمارە یە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەردەوام بووە لەسەری٠**

**★قنوت : ئەم دوعایە لەدوای هەڵسانەوە لەرکوع دەخوێندرێ لەکۆتا رکەعەت٠جالەکاتی ڕوو داوو تەنگ و چەڵەمە و ناخۆشییەکان هەروەها بەبێ ئەمانەش دەخوێندرێ ، نموونەیەکی نزای قنوت :** ((اللهم اهدني في من هديت ، وعافني في من عافيت ، وتولني في من تو ليت ، وبارك فيما أعطيت ، وقني شرما قضيت ، انك تقضي ولايقضي عليك ، انه لا يذل من واليت تباركت ربنا وتعاليت))٠

**دروستە قنوت بەهەرجۆرە دوعایەك ، کەخۆی ئارەزووی لەسەریەتی ، وەدروستە بەدەنگی بەرز بیڵێ و ئەوانەی لەدواوەی نوێژدەکەن بەدەنگی بەرز (ئامین)بڵێن ، وەهەروەها دە — ستیشیان بەرزبکەنەوە٠**

**★ئەریك فرۆم : فەیلەسوف و دەروونناسێکی ئەڵمانی یە ، لەساڵی (١٩٧٩) کۆچی دوایی کردووە٠**

سەرچاوەکان : -

نووسینەکانی ئەم کتێبە لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە : -

یەکەم – کتێب :

١ – قورئانی پیرۆز٠

٢ – عبدالعزیزالمقبل ، پەنجاگوڵی جوان لەکێڵگەی ئامۆژگارییەکان بۆئافرەتانی موسوڵمان ، و : عەتامحەممەد ، چ٤ ، بێ شوێنی چاپ ، بێ ساڵی چاپ٠

٣ – ئەبوبەکرتۆفیق ، فەرموودەقودسییەکان ، ٢٠٠٧

٤ – ڕەمەزان حەمەدەمین و سەنگەرنازم ، دیوانی دڵدار ، چ١ ، چاپخانەی کامەران ، ٢٠١٩

٥ – کاروان سلێمان کاکەمەد ، کورتەباسێك لەبارەی هۆزەکانی شاری هەولێر، هەولێر ، ٢٠١٧

٦ – ئەحمەدسالار ، وتاربێژی و دەمودو ، بەرگی یەکەم ، هەولێر ، ١٩٩٨

٧ – بێ ناوی نوسەر ، هەوڵدان و زەخیرەدانان بۆڕۆژی دوایی ، بێ شوێنی چاپ ، بێ ساڵی چاپ٠

٨ – ئەحمەدشەریف ، پوختەی بانگ و قامەت بەپێی فیقهی شەریعەت ، چ١ ، چاپخانەی شارستان ، سلێمانی ، ٢٠١٥

٩ – محەممەد عەلی ئووەیسی ، زمانی کوردی لەبەرانبەرهوروژمی شەپۆلی ناشارەزایی دا ، چ١ ، ناوەندی بلاّوکردنەوەی (انتشارات) ناجی ، بانە ، ١٣٨٨ی هەتاوی – ٢٠١٠ی میلادی٠

١٠ – بێ ناوی نوسەر ، پەنجافەرموودەی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، چ١ ، ١٩٩٢

١١ – ئەحمەدئەسکەندەرئیبراهیم ، پەیامێك بۆگەنجان ، چاپخانەی منارە ، هەولێر ، چ١ ، ٢٠٠٩

١٢ – کۆماری عیراق ، وەزارەتی پەروەردە ، پەروەردەکردنی موسوڵمانانەبۆپۆلی چوارەمی قوتابخانەگەلی یەکان ، چ١ ، هەولێر ، ١٩٧٩

١٣ – محمدسعیدابراهیم محمدی ، گەشتێ لەعیلمی بەلاغە ، چ١ ، چاپخانەی مهارات ، تاران ، ١٣٦٤ی هەتاوی٠

١٤ – ئەحمەدحەسەن حەمەد ، (التوسل) داواکردن لەخوای گەورە بەخاتری پێخەمبەر(درو

دی خوای لەسەربێ)وپیاوچاکان ، چ٢ ، چاپخانەی ڕۆژهەلأت ، هەولێر ، ٢٠١٣
١٥ – فاتیح مەلاڕەسول شارستێنی ، هەناسەی دڵ ، بەرگی دووەم ، چاپخانەی گەشە ، سلێما نی ، ٢٠١٨
١٦ – عبدالرحمن حیدری ، چەپکێ گوڵ مافی دایك وباوك ٠٠٠ ، ١٩٩٦
١٧ – نبیل عبدالرحمن المحلیش ، پیلانی نەهێشتن ولەناوبردنی ئیسلام و بنبڕکردنی موسو ڵمانان لەچەرخی نوێ دا ، و : خەبات صلاح الدین ابراهیم ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ١٩٩٤
١٨ – فاتیح مەلاڕەسول شارستێنی ، هەناسەی دڵ ، بەرگی یەکەم ، چ١ ، چاپخانەی گەشە ، سلێمانی ، ٢٠١٨
١٩ – ئارام نەبی مەحمود ، هاوسەرگیری سومبولی خۆشەویستی و هێلانەی وەفادارییە ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆژهەلأت ، هەولێر ، ٢٠١٢
٢٠ – فاتیح مەلاڕەسول شارستێنی ، لەخواغافل مەبە ، بەرگی یەکەم ، چ١ ، سلێمانی ، ٢٠١٧
٢١ – فاتیح مەلاڕەسول شارستێنی ، لەخوا غافل مەبە ، بەرگی دووەم ، چ١ ، سلێمانی ، ٢٠١٧
٢٢ – کۆچەرئیسماعیل هەمەوەندی ، نەخۆشییە دەروونییەکان لەنێوان ئاین و ئەفسانەو زانست دا ، چ١ ، چاپخانەی پەیوەند ، سلێمانی ، ٢٠١٢
٢٣ – حەکیم خۆشەوی ، ئەخلاق لەبەڕێوەبردن دا ، چ١ ، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٥
٢٤ – ئەبوحەسەن نەدەوی ، چیرۆکی پێخەمبەران (علیهم السلام) بۆنەوجەوانان ، و : بە یان محمد رەحیم ، چ١ ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی ، ٢٠٠٩
٢٥ – حسان شمسی پاشا ، خۆت و کەسانی تربەختەوەربکە ، و : موسی محمدعبدالرحمن ، چ١ ، چاپخانەی پەیوەند ، سلێمانی ، ٢٠٠٩
٢٦ – خالدالحسینان ، زیاترلە (١٠٠٠) گوڵی بۆنخۆش وجوان پێشکەش بەخوشکی موسوڵمان ، و : باوکی عبدالله ، چ١ ، ٢٠١١
٢٧ – ئوسامە ئیبراهیم حافز ، عاصم عبدالماجد محمد ، بەکافردانانی موسوڵمانان و ڕۆچوو ن لەدین دا حەرامە ، و : تۆفیق سەلیم ، چ١ ، ٢٠٠٩
٢٨ – نەوامحەممەدسەعید ، بالأپۆشی ئافرەتی موسوڵمان ، چ٩ ، نوسینگەی تەفسیر، هەولێر

، ٢٠١٨

٢٩ – ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان ، ژیاننامەی خانەوادەی محمد(درودی خوای لەسەربێ) ، چاپخانەی حاجی هاشم ، هەولێر ، ساڵی چاپی نییە٠

٣٠ – محمدبن ابراهیم الحمد ، ئینتەرنێت تاقیکردنەوەی باوەڕوڕەوشت وهزرەکانە ، و : ڕۆ ستەم فتح الله عبدالله ، چ١ ، ٢٠١٢

٣١ – خولی هاوینە ، تیشکێك لەزانیارییەکانی قورئانی پیرۆز ، ١٩٩٩

٣٢ – محمدقوتب ، بادەربچین لەتاریکایی سەرگەردانی ، و : ابراهیم حسن سعید ، چ١ ، هەو لێر ، ٢٠١١

٣٣ – ئاکۆجەلیل کەریم ، زانست و فێرخوازانی ، چ١ ، چاپخانەی زانا ، سلێمانی ، ٢٠١١

٣٤ – عەفان شێخ صدیق سەرگەتی ، ڕێگای بەهەشت لێرەوەیە ، چ١ ، چاپخانەی سیما ، سلێمانی ، ٢٠٠٥

٣٥ – ئیدریس کەریم کاریتانی ، گەنجان لەنێوان گرفتی سەردەم وچارەسەردا ، چ١ ، چاپخا نەی نارین ، ٢٠١٠

٣٦ – داناعوسمان ، هەنگاوێك بەرەوڕاستگۆیی ، چ٢ ، چاپخانەی ئارا ، ٢٠٠٨

٣٧ – عبدالخالق عبدالله ، ئافرەتی موسوڵمان و ململانێی سەردەم ، چ١ ، چاپخانەی چوار چرا ، سلێمانی ، ٢٠٠٦

٣٨ – ئیمام جەلالەددین سیوطي ، مێژووی خەلیفەکانی ئیسلام (ڕاشیدین ، ئومەوی ، عە بباسی) ، و ، نصرالدین عبدالرحمن قادر ، چ١ ، کۆمپانیای چاپ وپەخشی نوسەر ، ٢٠٠٧

٣٩ – عەلی تەنتاوی ، ئەی کچەشیرینەکەم ، و : محەممەدمەلاصالح شارەزووری ، ژمارەی چا پی نییە ، ساڵی چاپی نییە٠

٤٠ – اسراء صدیق عبدالعزیز ، سەلیقەی دایکان و نهێنییەکانی منداڵ ، ئۆفسیتی پیرە مێرد ، هەڵەبجەی شەهید ، ٢٠٠٢

٤١ – عبدالهادی سیدمحمد تقی حکیم ، وتووێژلەبارەی شەریعەتەوە ، و : داودقەرەولوسی ، چ١ ، ٢٠٠١

٤٢ – مەهدی پیشوایی ، مێژووی ئیسلام لەچەرخی نەفامییەوە تاکۆچی دوایی پێخەمبەری

ئیسلام (درودی خوای لەسەربێ) ، و : داودقەرەولوسی ، چ١ ، ٢٠٠٦

٤٣ — عبدالرحمن مەلا تاها عەزیز ، مەوسوعەی فیقهی حەج و عومرە ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠١٠

٤٤ — ماکوان کەریم ، گفتوگۆی ناخ لەگەڵ دڵ و دەروون و عەقل ، ٢٠١٣

٤٥ — فاتیح مەلاڕەسول شارستێنی ، بنیادنانی کەسایەتی چۆن دەبێت و بەرز ڕادەگیرێت ؟ ، چ١ ، چاپخانەی گەشە ، سلێمانی ، ٢٠١٧

٤٦ — عومەرعەلی غەفور ، ئەخلاق لەسیاسەت دا ، چ١ ، چاپخانەی ژین ، هەولێر ، ٢٠٠٢

٤٧ — باوکی ڕوئیا ، هەزاروپێنجسەد پرسیارو وەڵام ، چاپخانەی یاوەران ، چ٥

٤٨ — ئەندازیارعوسمان ، بەرەوپەروەردەی ئیسلامی ، بەشی دووەم ، چ١ ، بێ ساڵی چاپ٠

٤٩ — بەیاد نەجات عەلی ، خواویستی وخۆنەویستی ، چ١ ، چاپخانەی پەیام ، هەولێر ، ٢٠١٠

٥٠ — عبدالرحمن قادریونس ، ئافرەت لەقورئان دا ، هەولێر ، ١٩٨٤

٥١ — محمدسعیدرمضان البوطي ،بۆهەمووکیژێکی خاوەن باوەڕ ، و : عمرأحمدنظامي ، چ٥ ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی ، ٢٠٠٥

٥٢ — عوسمان هەڵەبجەیی ، سەرابەکان نابنە کانی ، بەشی یەکەم ، چاپخانەی ئارا ، ٢٠٠٦

٥٣ — موسلیم مەلاصالح فریزی ، گوڵبژێرێك لەبابەتەکانی مەلایەکی کورد لەسەرتۆڕی ئینتەرنێت ، چ١ ، ٢٠٠٩

٥٤ — بەندەی پەرستکار ، ڕوناکییەکانی باوەڕوتاریکییەکانی بێ باوەڕی ، چ١ ، چاپخانەی سیڤا ، سلێمانی ، ٢٠١٠

٥٥ — عبدالله محمدداودسەنگاوی ، دەروازەی بەهەشت ، چ٢ ، ٢٠٠٩

دووەم – گۆڤار :

١ – ژیار ، ژمارە (٣١) ، ٢٠٠٠

٢ – هەڵەبجە ، ژمارە (١٠) ، ٢٠٠٧

٣ – ژیار ، ژمارە (٢) ، ٢٠٠٠

٤ – ژیار ، ژمارە (٥) ، ٢٠٠٠

٥ – راکۆ ، ژمارە (٩) ، ٢٠١١

٦ – ڕۆژی سلێمانی ، ژمارە (٢٦ – ٢٧) ، ٢٠١٥

٧ – سایك ، ژمارە (١) ، ٢٠٠٦

٨ – سایك ، ژمارە (١٠) ، ٢٠٠٧

٩ – سایك ، ژمارە (٦) ، ٢٠٠٦

١٠ – سایك ، ژمارە (٨) ، ٢٠٠٦

١١ – سایك ، ژمارە (٢) ، ٢٠٠٦

١٢ – سایك ، ژمارە (٣) ، ٢٠٠٦

١٣ – شاووشکا ، ژمارە (١) ، ٢٠٠١

١٤ – شاووشکا ، ژمارە (٢٦) ، ٢٠٠٨

١٥ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (١٧) ، ٢٠٠٢

١٦ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (١) ، ١٩٩٨

١٧ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (٢١) ، ٢٠٠٣

١٨ – خۆری شیسلام ، ژمارە (١٤) ، ٢٠٠١

١٩ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (٢٧) ، ٢٠٠٥

٢٠ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (٢٤) ، ٢٠٠٤

٢١ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (١١) ، ٢٠٠١

٢٢ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (١٢) ، ٢٠٠١

٢٣ – هەڵبوون ، ژمارە (٤٧) ، ٢٠١٠

٢٤ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (٢) ، ١٩٩٨

٢٥ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (٢٦) ، ٢٠٠٤

٢٦ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (٣٥) ، ٢٠٠٧

٢٧ – خۆری ئیسلام ، ژمارە (٩) ، ٢٠٠٠

٢٨ – ڕوانگە و ڕەخنە ، ژمارە (١٠) ، ٢٠٠٥

٢٩ – چلاواز ، ژمارە (٣٧) ، ٢٠٠٩

٣٠ – چلاواز ، ژمارە (١٨) ، ٢٠٠٧

٣١ – چلاواز ، ژمارە (١٩) ، ٢٠٠٧

٣٢ – چلاواز ، ژمارە (٥) ، ٢٠٠٦

٣٣ – پاراسایکۆلۆژی ، ژمارە (٧) ، ٢٠٠٧

٣٤ – پەیامی ڕاستی ، ژمارە (١٨) ، ١٩٩٣

٣٥ – پێشکەوتن ، ژمارە (٨٦) ، ١٩٩٩

٣٦ – پێشکەوتن ، ژمارە (١١٣) ، ٢٠٠٢

٣٧ – پەیامی ڕاستی ، ژمارە (٦٨) ، ٢٠٠٣

٣٨ - پێشکەوتن ، ژمارە (٩١) ، ٢٠٠٠

٣٩ – پێشکەوتن ، ژمارە (١٨١) ، ٢٠١٢

٤٠ – پێشکەوتن ، ژمارە (١٧٣) ، ٢٠١١

٤١ – پێشکەوتن ، ژمارە (٧٣) ، ١٩٩٨

٤٢ – پەیامی ڕاستی ، ژمارە (٣٨) ، ١٩٩٥

٤٣ – پەیامی ڕاستی ، ژمارە (٧٤) ، ٢٠٠٦

٤٤ – ژیار ، ژمارە (٠) ، ٢٠١٢

٤٥ – هەیف ، ژمارە (٤٧) ، ٢٠١٧

٤٦ – تەندروستی و کۆمەڵ ، ژمارە (٣٠) ، ٢٠١٢

٤٧ – چارە ، ژمارە (١٩) ، ٢٠١٢

٤٨ – چارە ، ژمارە (٢٠) ، ٢٠١٢

٤٩ – بەیان ، ژمارە (١٠١ - ١٠٢) ، ١٩٨٤

٥٠ — پاداشت ، ژمارە (١٤) ، ٢٠١٣

٥١ — کۆمەڵایەتی سەردەم ، ژمارە (٧) ، ٢٠٠٨

٥٢ — مرۆڤ ، ژمارە (١) ، ٢٠١٥

٥٣ — پەیامی زانایان ، ژمارە (٩٥) ، ٢٠١٣

٥٤ — ئۆتۆنۆمی ، ژمارە (٥٧) ، ١٩٨٧

٥٥ — ئۆتۆنۆمی ، ژمارە (٥٨) ، ١٩٨٨

گەلێ سەرچاوەی تریش ٠٠٠

# ناوەڕۆك